

# دیبەیتی سال
# سیکۆلاریزم و دیموکراسی لە ئەزموونی کوردستاندا

**نوســـینی**
عەلی باپیر
**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوە
**نەخشەسازی ناوەوە و بـــەرگ**
نەوزاد کاوانی
**خـــەتی بـــەرگ**
نـــەوزاد کـۆیـــی
**قـەبـاره**
١٧× ٢٤ - ( ١٢٠ ) لاپەڕە
**نۆرە و ساڵی چاپ**
یەکەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦
**تـــیراژ**
١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان / هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی ( ٤٥٦ ) ی ساڵی ٢٠١٦ ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com



دیبەیتی ساڵ

# سیکولاریزم و دیموکراسی له ئەزموونی کوردستاندا

نوسینی

عەلی باپیر



بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾ النحل.

## پێشكەش بۆ

به هەركەسێك، كه هیچ شتێك: نه خۆبەزلگریی،

نەبەرژەوەندیی تایبەتیی، نەقەناعەت هێنانی پێش بیركردنەوە،

ناتوانێ لەبەردەم هەق وەرگرتنیدا، ببێته كۆسپ و لەمپەر.

# پێشەکی و
# پێناسەی ئەم کتێبە

خوێنەری بەڕێز!

دوای ئەوەی لە ئێوارەی ڕۆژی: ١٠/٤/ ٢٠١٦ز دا، لە هۆڵی (تەوار) لە شاری سلێمانیی، لە نێوان بەندەو کاك مەلا بەختیاردا، دیبەیت (مناظرة)یەك ئەنجامدرا، لە لایەن بەڕێزان:

١- پرۆفیسۆر میشێل ڤیڤیۆرکا: سەرۆکی خانەی زانستە مرۆڤییەکانی پاریس و سەرۆکی کۆلێژی جیهانی بۆ توێژینەوە.

٢- د. عادل باخەوان: مامۆستا لە زانکۆی ئیڤریی و، توێژەری هاوکار لە قوتابخانەی خوێندنی باڵای زانستە کۆمەڵایەتییەکانی پاریسەوە سەرپەرشتیی کرا.

خەڵکێکی زۆر داوایان کرد، کە دەقی قسەکانی بەندە، چ هی وتارەکەم، چ هی وەڵامی پرسیارەکانی کاك مەلا بەختیار، بە نووسراوەییش لەبەر دەست دا هەبن.

هەر بۆیەش پاش نووسرانەوەی دەقی قسەکان لەلایەن برایانی دڵسۆزەوە، منیش دەستێکم پێداهێناو، ئەم بەرهەمەی بەردەستتی لێ دەرچوو.

ئنجا لێرەدا پێویستە چەند شتێك ڕوون بكەینەوە:

١- دەقی ئەو قسانەی كە لە بابەتەكەداو، لە كاتی وەڵامدانەوەی پرسیارەكاندا هاتوون، وەك خۆیان هێڵراونەوەو، هەندێك شتیش كە لە دەستنووسی ئامادەكراوی لای خۆمدا بوون و لەبەر كەمیی كات فریای گوتنیان نەكەوتووم، زیادم كردوون، كە لە ڕووی نێوەڕۆكەوە گۆڕان بەسەر قسەكانی نێو دیبەیتەكەدا ناهێنن، ئەوەندە هەیە تیشكی زیاتر دەخەنە سەر بابەتەكە.

٢- هەندێك دەقی قورئان و سوننەت، كە وەك بەڵگە هێنانەوە لەسەر قسەكان خراونە ڕوو و، لە كاتی دیبەیتەكەدا دەرفەتی خستنە ڕوویانمان نەبووە، زیاد دەكەین.

٣- ئاماژە دەكەین بە هەندێك سەرچاوەو ناوی هەندێك لە زانایان، كە لە دەقی بابەتەكەدا، دەرفەتی باسكردنیانمان نەبووە.

٤- بەپێویست نەزانرا، دەقی هەموو قسەو پرسیارەكانی كاك مەلا بەختیار بخرێتە ڕوو، چونكە بە زۆریی دوور بوون لە چوار چێوەی بابەت (موضوع)ەكە، كە باسی {سیكۆلاریزم و دیموكڕاسی لە ئەزموونی كوردستاندا} بوو، واتە: تەنیا جێی مەبەستمان لە قسەو پرسیارەكانی هێناوەتەوە.

٥- چەند قسەیەكی كاك مەلا بەختیار، كە لە پێنج دەقەی كۆتاییدا كردنی، یان پێشتر كردبوونی و، بواری وەڵامدانەوەیان نەبوو، بە كورتیی وەڵامێكیان دەدەینەوە.

٦- بۆ بەرچاو ڕوونیی خوێنەران لەسەر میكانیزم و شێوازی بەڕێوەچونی دیبەیتەكە، بە پەسندی دەزانم، دەقی ئەو نامەیەی كە مانگێك زیاتر پێش كاتی دیبەیتەكە، لەلایەن هەردووك بەڕێوەبەرو سەرپەرشتیارەكەیەوە، پێم گەیشتبوو، لەوبارەوە بخەینەڕوو.

٧- تاكە تێبینی و سەرنجێكیش، كە بە پێویستم زانی لەسەر شێوەی بەڕێوەبردنی دیبەیتەكە بیخەمەڕوو، ئەوەیە كە كاتێكی كەم (نیو سەعات) بۆ خستنەڕووی دوو بابەتی قسە هەڵگرو بە چڵ و پۆپی، وەك سیكۆلاریزم و دیموكڕاسی دانرابوو، كە پێم وایە ئەگەر تەنیا بابەتێكیان بوایە، باشتر دەگونجا مافی خۆی بدرێتێ.

**بە پێویستیشی دەزانم، سوپاس و دەستخۆشیی و پێزانینم ئاڕاستەی ئەو كەسایەتیی و لایەنانەی خوارەوە بكەم:**

١- كاك مەلا بەختیار كە ئامادەبوو پێكەوە ئەو دیبەیتە بكەین.

٢- پرۆفیسۆر میشێل ڤیڤیۆركا و دكتۆر عادل باخەوان، كە دیبەیتەكەیان سەركەوتووانە بەڕێوەبرد.

٣- كەناڵی ڕووداو، كە سپۆنسەری دیبەیتەكەی كردو، ڕاستەوخۆو پیشەییانە گواستیەوە.

٤- هەردووك كەناڵی (پەیام) و (كوردسات)، كە ئەوانیش وێڕای (ڕووداو)، ڕاستەوخۆ گواستیانەوە.

٥- تێكڕای بینەران و بیسەرانی بەڕێز، كە لە نێوەو دەرەوەی كوردستاندا: بینەرو بیسەری قسەو باسەكانمان بوون.

پێشم وایە ئێمەی گەلی كوردستان ((لە هەموو شوێنەكانی كورستان، باكوور، باشوور، ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا)) لەم هەل و مەرجەدا، لە هەموو كات زیاتر پێویستیمان بە پێكەوە قسەو باسكردن و لە یەك تێگەیشتن هەیە، كە بێگومان بەبێ ئەوە، هاوكاریی پێكەوە كردن و دەستبار بۆ یەكدی گرتن و كاری پێكەوەیی و هەرەوەزیی، مەیسەر نابێ.

كۆتایی ئەم پێشەكیی و پێناسەیەش، بەم چەند قسەیە دێنم "پاش كورتكردنەوەیان" كە هەشت (٨) ساڵ لەمەوبەر (٧ كانوونی دووەمی ٢٠٠٨ز) لە پێشەكیی

كتێبی: (تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەكانیان)دا، لە چاپی یەكەمدا نووسیومن:[1] {ئیسلامیی و عەلمانیەكانی كوردستان، لەگەڵ جیاوازییە گەورەو گرنگەكانی نێوان ئایین و بەرنامەكانیان، ئامانجی گەورەو گرنگی زۆری هاوبەشیشیان هەن، ئەگەر بیانەوێ لەسەر بناغەی تەبایی و پێكەوە ژیان و خزمەت بە گەل و وڵات پێكەوە هاوكارو دەستبارگربن، بۆ نموونە:

١- پارێزگاریی لێكردن و دەستەبەركردنی مافەڕەواكانی خەڵكی كوردستان..

٢- بەرەو پێش بردنی زانست و گەشە پێدانی ئاستی خوێندن...

٣- ئاوەدان كردنەوەی وڵات و دروستكردنی ژێر خانی ئابووریی...

٤- چەسپاندنی دادگەریی و چارەسەر كردنی دیاردەی ترسناكی قڕیی و پڕیی و چینایەتیی.

٥- خۆشكردنی گوزەرانی خەڵك لە هەموو ڕوویێكەوە.

٦- پارێزگاریی لێكردنی خێزان و ئاسانكاریی كردن بۆ پرۆسەی هاوسەرگیریی...

٧- پێشگیریی كردن لە داڕووخانی ئەخلاق و بەها بەرزەكان، بە تایبەت لە نێو توێژی گەنجان دا...}.

٢٣/ رجب/ ١٤٣٧ ك

٣٠/ ٤/ ٢٠١٦ ز

---

(١) بڕوانە: چاپی سێیەم ساڵی ٢٠٠٨ ز، لاپەڕە ١٥ و ١٦.

## ئەو نامەیەی کە نەخشە ڕێگای بەڕێوەچوونی دیبەیتەکەی گرتبووە خۆی

**چوار چێوەیەکی بابەتیانە بۆ دیبەیتێکی زانستی لەسەر دیموکڕاسیی و عەلمانییەت لە کوردستاندا.**

سەرەتا پێمان خۆشە بە سوپاسی هەر یەکێك لە ئێوەی بەڕێزەوە دەست پێبکەین، کە بە ئیجابی وەڵامی ئەم پێشنیارەتان دایەوە و، ئەوەش بەڵگەیە لەسەر دڵسۆزیتان بۆ پرسی پێکەوە ژیان و ئاشتی کۆمەڵایەتیی، بەجیاوازیەکانمانەوە، لە کوردستاندا.

**بەڕێزان!** لە بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا، هەرێمی کوردستان هەمیشە جێگای چەندین تێز و دژە تێز بووە، لەسەر هەر دوو پرسی دیموکڕاسیی و عەلمانییەت لە نێو ئەم مێژووەدا، دوو بەرە جیاکراونەتەوە، بەرەیەك وەك لایەنگر و تێکۆشەر لە پێناو بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی دیموکڕات و عەلمانییدا خراوەتە سەر شانۆ و، بەرەیەکی دیکە وەك دوژمنی سەرسەختی کۆمەڵگای دیموکڕات و عەلمانیی خراوەتە سەر هەمان شانۆ، لە کاتێکدا واقیعی سیاسی کوردستان زۆر لەوە ئاڵۆزترە، کە بەم ئاسانییە بخوێنرێتەوە و بەم سادەییە دابەش بکرێ، ئەم جۆرە لە دابەش کردن، نەك هەر ڕەنگدانەوەی واقیعی کۆنکریتی ژیانی ڕۆژانەی ئەکتەرە سیاسیەکانی کوردستان نیە، بەڵکو بینینی خودی ئەو واقیعەش بەشێوەیەك تێکدەدات، کە چیدی سەرە داوەکانی دەست کەسمان نەکەون.

لێرەوە، ئێمە لە قوتابخانەی خوێندنی باڵای زانستە کۆمەڵایەتیەکانی پاریس و خانەی زانستە مرۆییەکانی پاریس، بۆ لادانی ئەو پەردانەی، کە بەسەر ئەو واقیعە کۆنکرێتیەدا دراون، دەیبەیتێك لە نێوان بەڕێزان کاك "مەلا" بەختیار و "مامۆستا" عەلی باپیردا ساز دەکەین (ناوەکان بە پێی ڕیزبەندی ئەلیف و بێ دانراون و هیچ پەیوەندیەکی بە پێگەی سیاسی و تەمەنەوە نیە)، لە بیست و پێنج ساڵی ڕابردوودا، هەر یەکێك لەم دوو ئەکتەرە، نەك هەر بەرهەمێکی زۆر، یان لەسەر هەر یەکێك لەم دوو چەمکە بەرهەمهێناوە، نەك هەر لە دوو پێگەی سیاسی باڵادان، بەڵکو کارایی ڕاستەوخۆیان بەسەر کۆمەڵگای کوردستانیەوە دانەوە و، لای چەندین ئەکتەری کۆمەڵایەتی و سیاسی وەك "سەرچاوەی مۆبیلیزاسیۆن / تعبئة" وێنا دەکرێن.

دوور لە دەنگە دەنگی سەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان، دوور لە "موزایەدە" سیاسیەکان، دوور لە هاندان و چەپڵەلێدان و هوتافکێشان، ئامانجی یەکەمی ئەم چالاکیە بریتیە لە دروستکردنی چوارچێوەیەکی بابەتیانە، بێلایەنانە، ئەکادیمیانەی دیبەیت لە نێوان ئەم دوو ئەکتەرەدا، کە بەشێکی زۆر لە ژیانی خۆیان بۆ کردەی "تەنزیر" لەسەر دیموکراسی و عەلمانییەت تەرخان کردوە،

لە ڕێگای ئەم دیبەیتەوە، ئێمە هەوڵدەدەین ڕووناکی بخەینە سەر ئەو هێڵە تیۆریانەی، کە ئەم دوو ئەکتەرە، کە بڕیارە نوێنەرایەتی دوو دنیای سیاسی و کۆمەڵایەتی لێکجیاواز بکەن، لە یەك جیادەکەنەوە، هەروەك هەوڵدەدەین ڕووناکی بخەینە سەر ئەو پردانەی، کە ئەم دوو دنیایە بەیەکەوە دەبەستنەوە.

**چۆنیەتی بەڕێوەبردنی دیبەیتەكە:**

بەروار: (١٠)ی (٤)ی ٢٠١٦.

شوێن: هۆڵی تەوار.

كاتژمێر: (٤)ی پاش نیوەڕۆ.

جەماوەر دەتوانێت ئامادەبێ، بەبێ ئەوەی مافی بەشداریكردنی هەبێ، كەناڵەكان دەتوانن دیبەیتەكە بگوێزنەوە، بەبێ ئەوەی مافی بەشداریكردنیان هەبێ، بەڕێز مامۆستا عەلی باپیر لای ڕاستەوە دادەنیشێت و بەڕێز كاك بەختیار لای چەپەوە. هەروەها پرۆفیسۆر میشێل ڤیڤیۆركا، سەرۆكی خانەی زانستە مرۆییەكانی پاریس و من لە نێوان هەردوو لادا. ئێمە پێكەوە ئیدارەی دیبەیتەكە دەكەین.

بەڕێزان باپیر / بەختیار هەر یەكەیان بۆ ماوەی بیست و پێنج (٢٥) خولەك بابەتی خۆیان لەسەر دیموكراسیی و عەلمانییەت پێشكەش دەكەن، پاش تەواوبوونیان هەر یەكەیان پازدە (١٥) خولەكی هەیە بۆ موناقشەی تێزەكانی ئەوی دیكە، دواتر پرۆفیسۆرمیشێل ڤیڤیۆركا موناقەشەی تێزەكانی هەردوو بەڕێزان دەكات بۆ ماوەی بیست و پێنج (٢٥) خولەك و هەر یەكێك لە بەشداربووانیش (١٥) خولەكی هەیە بۆ وەڵامدانەوە كۆی كۆڕەكە دەكاتە سەدو پەنجا (١٥٠) خولەك.

زمانی بەكارهێنراو بریتیە لە كوردی و ئینگلیزی.

پرۆفیسۆر میشێل ڤیڤۆركا: سەرۆكی خانەی زانستە مرۆییەكانی پاریس، سەرۆكی كۆلێژی جیهانی بۆ توێژینەوە.

دكتۆر عادل باخەوان: مامۆستا لە زانكۆی ئێڤری و توێژەری هاوكار لە قوتابخانەی خوێندنی باڵای زانستە كۆمەڵایەتیەكانی پاریس.

## ڕێ خۆشکردن

**خوێنەری بەڕێز!**

**باس و بابەتەکانی ئەم کتێبە، بەمجۆرە دانراون:**

بەشی یەکەم: سیکۆلاریزم (Secularism)

بەشی دووەم: دیموکڕاسی (Democracy)

بەشی سێیەم: ئەنجامگیریی: سیکۆلاریزم و دیموکڕاسی لە ئەزموونی هەرێمی کوردستاندا.

بەشی چوارەم: وەڵامدانەوەی پرسیارەکان.

دیارە بەشەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم، لە دەقی ئەو بابەتەدا بوون، کە پێشکەشم کرد، بەشی چوارەمیش بریتیە لە وەڵامدانەوەو ڕوونکردنەوەکانی من لەسەر قسەکانی کاک مەلا بەختیار.

بەشی پێنجەم: وەڵامی چەند قسەیەك، کە لە دیبەیتەکەدا فریای وەڵامدانەوەیان نەکەوتم.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الحمدلله، وصلى الله تعالى وسلم وبارك على رسول الله،
محمد وآله المهتدين بهداه

سەرەتا بەخێر هاتنی هەموو لایەك دەكەم، برایان و خوشكان، چ ئەوانەی نێو هۆڵەكە، چ ئەوانەی دەرەوە، وە هەموو ئەوانەی گوێیان لە قسەكانمانە، وە دەمانبینن لە هەرێمی كوردستان و، لە دەرەوەی هەرێمی كوردستانیش، وە پاشان زۆر سوپاسی هەردوو بەڕێزان: پرۆفیسۆر میشێل ڤیڤیۆركاو، كاك دكتۆر عادل باخەوان دەكەم، كە ئەم دیبەیتەیان سازدا، وە سوپاسی كاك مەلا بەختیاریش دەكەم، كە ئامادەیی دەربڕی، تاكو بەیەكەوە ئەم گفتوگۆو دیبەیتە ئەنجام بدەین.

**بەڕێزان!** پێش ئەوەی بێمە سەر پێشكەشكردنی بابەتەكەم، دەمەوێ چوار تێبینی كورت بخەمە ڕوو:

١- هەوڵدەدەم كە زۆر بابەتییانە قسە بكەم و، بە هیچ جۆرێك خود نەخەمە نێو بابەتەكەو قسەكانمەوە.

٢- ناچارم لەبەر كەمیی كات، زۆر بە گوشراویی و بە چڕیی و پڕیی، بابەتەكەم بخەمەڕوو، ئێوەش هەمووتان خوێندەوارو ڕۆشنبیرن، بە كەم لە زۆر دەگەن، بۆیە مەتنەكەی دەڵێم و، شەرحەكەی عایدی خۆتان دەكەم!

٣- هەوڵدەدەم بە ملاولادا نەچم و، ئەو دوو بابەتەی دیاریی كراون، باسی: (سیكۆلاریزم و "سیكۆلاریزەیشن" لەگەڵ دیموكڕاسی) وە ناپەڕژێمە ئەملاولا، چونكە باس و بابەت زۆرن و، ئەگەر بێت و هەر تیرە لە كەنداڵێك بدەین، لێنابینەوە.

٤- ئایا ئەم دیبەیتە پێویست بوو، یان نا؟ وەك كاك عادلیش باسی کرد، گوتراوە: کە ئێمە ئێستا قەیرانی ئابووریمان هەیەو، شەڕی داعش هەیە، وە کۆمەڵێك گرفت و نەهامەتیی هەن، کە یەخەو بەرۆکی هەرێمەکەمانیان گرتوە، ئنجا ئەوە هەمووی ڕاستە، بەڵام ئەم دیبەیتە بۆیە پێویستە "بە بۆچوونی من" کە ئەو سیکۆلاریزمە، کە لەم وڵاتەماندا گوتوومانە[1] پیادەی دەکەین، وە ئیدیعای پێوە پابەند بوونی دەکەین، وە ئەو دیموکراسیەتەی، کە بانگەشەی بۆ دەکەین، پێم وایە، کە لەگەڵ هیچیان دا ڕاستمان نەکردوە، بۆیە ئەم واقیعە ناهەموارەی لێکەوتۆتەوە.

کەواتە: جێی خۆیەتی ئێمە لەوبارەوە وتوویژ بکەین، تاکو بزانین سیکۆلاریزم چییە و چۆنە؟ وە دیموکراسی چییە و چۆنە؟ وە من بابەتەکە بۆ سێ بەش دابەش دەکەم:

**لە بەشی یەکەمدا، لە سێ تەوەردا، باسی سیکۆلاریزم دەکەم:**

تەوەری یەکەم: پێناسەی سیکۆلاریزم و سیکۆلاریزەیشەن.
تەوەری دووەم: بەسەرهاتی سەرهەڵدانی سیکۆلاریزم لە ڕۆژئاوا.
تەوەری سێیەم: سیکۆلاریزم لە کۆمەڵگایەکی لە ئیسلام تێگەیشتوودا، پاساوی بوونی نیە.

**لە بەشی دووەمدا، لە سێ تەوەردا، باسی دیموکراسی دەکەم:**

تەوەری یەکەم: پێناسەی دیموکراسی.
تەوەری دووەم: سەرگوزشتەی دیموکراسی.
تەوەری سێیەم: بەراوردێك لە نێوان سیکۆلاریزم و دیموکراسی لە واقیعی هەرێمی کوردستاندا.

**لە بەشی سێیەم دا هەڵدەستم بە ئەنجامگیریی و ئایا: سیکۆلاریزم و دیموکراسی لە ئەزموونی حوکمڕانیی هەرێمی کوردستان دا چۆنن؟!**

هەوڵیش دەدەم کاتەکە "نیو سەعات" بەسەر هەرسێك بەشەکەدا دابەش بکەم.

---

(١) واتە: حیزبە سیکۆلاریستەکان وایانگوتوە.

## تەوەری یەكەم:
## پێناسـە

دێمە سەر باسی پێناسەی سیكۆلاریزم، چەمكی سیكۆلاریزم، بە پێی ئەو سەرچاوانەی، كە من تەماشام كردوون، كە زیاتر لە سەد پێناسەم لەوبارەوە بینیوە، بەڵام باشترین پێناسە كە من بە دڵمە، ئەوەیە كە ئینسكلۆپیدیای بەریتانیی (دائرة المعارف البريطانية) هێناویەتی، كە دەڵێ:

{**سیكۆلاریزم (Secularism):** جووڵانەوەیەكی كۆمەڵایەتییە، دەیەوێ خەڵك لەگرنگیی دان بە ڕۆژی دوایی لابدات، وە ڕوویان پێ بسووڕێنێ بەرەو گرنگیی دان تەنیا بە ژیانی دنیا، ئەویش بە هۆی ئەوەوە، كە خەڵك لە سەدەكانی نێوەڕاستدا "واتە: خەڵكی ئەورووپا" ئارەزوویەكی توندیان هەبوو بۆ پشت تێكردنی دنیاو، بیر كردنەوە لە خواو لەڕۆژی دوایی، ئنجا بۆ بەرهەڵستیی كردنی ئەو حەزو ئارەزووە، سیكۆلاریزم لەمیانی گەشەپێدانی مرۆڤگەرایی دا، خۆی ڕانواند، وە خەڵك لە چاخی ڕێنیسانس دا، پەیوەست بوونی توندی خۆیان بە بەرهەم و دەستكەوتە كلتوورییە مرۆیەكانەوە، پێشاندا، وە قەناعەتیان پەیدا كرد، كە دەگونجێ ئاواتەكانیان لەم ژیانی دنیایەدا بێننە دی، ئیدی بەم جۆرە ڕوو كردنە سیكۆلاریزم، لە سەرجەم مێژووی تازەدا، لە پەرەستاندن دابوو، وەك بزاڤێكی دژی ئایین و دژی مەسیحیەت}[1].

من پێم وایە كورتترین پێناسە بۆ سیكۆلاریزم ئەوەیە: كە (كلود جفرای) هێناویەتی، دەڵێ: (سیكۆلاریزم: بریتییە لە لابردنی هەر مەرجیعێكی ئایینی).

---

(١) دائرة المعارف البريطانية، ج١٠، ص٥٩٤.

هەروەها (جول فیري) (١٨٣٢ - ١٨٩٣) کە ئەویش پێناسەیەکی کورتی هێناوە، دەڵێ: (سیکۆلاریزم: بریتیە لە ڕێکخستنی کۆمەڵگا بەبێ خوا).

وە دەشگونجێ بڵێین: (سیکۆلاریزم: بریتیە لە: بە سەنتەر گرتنی مرۆڤ و پشت گوێ خستنی خوا).

منیش دەڵێم: (سیکۆلاریزم: ئایینێکی زەمینی مرۆڤ کردە، بۆ جێ پێ گرتنەوەی ئایینی ئاسمانیی خوا)[1].

**ئنجا پێویستە لە بارەی سیکۆلاریزمەوە، ئەم چوار مەسەلەیەش بزانین:**

١- یەکەم کەس، کە بۆ یەکەم جار وشەی سیکۆلاریزمی بەکارهێنا (جۆرج جەیکۆب هۆلایوك) بوو، کە لە ساڵی (١٨٥٤) نامیلکەیەکی نووسی بە ناوی (سیکۆلاریزمی ئینگلیزیی).

٢- سیکۆلاریستەکان هەم کەسانی خواناسیان لە نێودا هەن، وە هەم کەسانی خوانەناسیش، پێم وایە زۆر لەسەر ئەو باسە نەچین باشە، سیکۆلاریستەکان هەردوو بەرەیان تێدابوون، بۆ وێنە: (جۆرج هۆلایوك) (١٨١٧-١٩٠٦) خواناس بووە، بەڵام (چارلس برادلۆو) (١٨٣٣-١٨٩٤) بابایەکی مولحید بووە، کە لە کتێبێکی دا، کە لە ساڵی (١٨٩٦) نووسیویەتی، دەڵێ: دەرەنجامی لۆژیکیی وەرگرتنی

---

(١) دەگونجێ بۆ زیاتر بەرچاوڕوونیی لە بارەی چەمك و واتای وشەی (Secularism)ەوە، سەرنجی ئەم سەرچاوانە بدرێ:
١-معجم اللغة البريطانية (٣١/ ١١٣٨).
٢-معجم أكسفور، ٨٤٩ – ٨٥٠.
٣-معجم ويبستر، ٢٠٥٣.
٤-دائرة المعارف البريطانية (١٠/ ٥٩٤).
٥-دائرة معارف الدين والأخلاق (٩/ ٥١١).
٦-الموسوعة الميسرة في الفكر الفلسفي والإجتماعي، ٢٧٣، د كميل الحاج.
٧-الموسوعة العربية (١٣/ ٤٢٣ - ٤٢٥).
٨-قاموس المصطلحات السياسية والدستورية، ٢٤٤، د. أحمد سعيفان.
٩-موسوعة السياسة (٤/ ١٧٩ – ١٨٠)، د. عبدالوهاب الكيالي.

سیكۆلاریزم، بریتیه له ئیلحاد، وه ئه‌م (چارلس برادلۆو)ه، كاتی خۆی پاش (جۆرج هۆلاێرك) به‌رپرسی (كۆمه‌ڵه‌ی سیكۆلاریستانی به‌ریتانیا) بووه[١].

٣- دیاره سیكۆلاریزم (Secularism) هه‌یه، وه‌ك بیرۆكه، وه سیكۆلاریزه‌یشه‌ن (Secularization) هه‌یه، وه‌ك پراكتیزه‌كردن و پیاده‌كردن، واته: (عه‌لمانییه‌ت) و (عه‌لمه‌نه).

٤- سیكۆلاریزمی گشتگیر هه‌یه، یاخود سیكۆلاریزمی سه‌خت و توند، كه ده‌یه‌وێ هه‌موو شتێك بخاته ژێر هه‌یمه‌نه‌و هه‌ژموونی خۆیه‌وه، وه سیكۆلاریزمی به‌ش (جزئي)یمان هه‌یه، یان سیكۆلاریزمی نه‌رم، كه به‌وه‌نده ئیكتیفا ده‌كات ده‌وڵه‌ت و ئایین لێك جیابنه‌وه، به‌ڵام نایه‌وێ بچێته نێو هه‌موو جومگه‌كانه‌وه‌و، نایه‌وێ ببێته به دیل بۆ هه‌موو شتێك.

**پوخته‌ی ڕای خۆم له‌باره‌ی پێناسه‌و چییه‌تی (ماهیة)ی سیكۆلاریزمه‌وه:**

من پێم وایه سیكۆلاریزم به گشتیی، یان ده‌ڵێ: خوا (سبحانه وتعالى) بوونی نیه و، ئایین ڕاست نیه، یاخود ده‌ڵێ: خوا ئه‌گه‌ر هه‌شبێ، بۆی نیه ده‌ست بخاته نێو كاروبارو ژیان و گوزه‌رانی مرۆڤ!! به‌ڵام دیاره كام خوا (سبحانه وتعالى)، وه كام ئایین؟! ئه‌و خوایه‌ی، كه ئه‌رستۆ ده‌یگوت: خوا بوونه‌وه‌ری وه‌ك سه‌عاتێك خستۆته‌گه‌ڕو لێیگه‌ڕاوه، نه‌ك ئه‌و خوایه‌ی كه ئیسلام پێناسه‌ی ده‌كات، كه هه‌میشه له‌گه‌ڵ به‌نده‌كانیه‌تی و به‌سه‌ریان ڕاده‌گات، وه ئایینی پڕ ئه‌فسانه‌ی كڵێسا، نه‌ك ئه‌و ئایینه‌ی، كه هه‌میشه له‌گه‌ڵ ڕه‌وتی ژیاندا ده‌ڕوات كه ئیسلامه، به‌ڵكو ئه‌و ئایینه‌ی كه به‌ربه‌ست بوو، له به‌رده‌م پێشكه‌وتن و له‌به‌رانبه‌ر ئازادیی عه‌قڵدا.

---

(١) هه‌ڵبه‌ته (خواناس) و (بڕوادار "مؤمن") له یه‌ك جیان، هه‌موو بڕوادارێك خواناسه، به‌ڵام مه‌رج نیه هه‌موو خواناسێك بڕوادار بێ، بۆ وێنه: ئیبلیس خوا ده‌ناسێ، به‌ڵام بڕوای پێی نیه، چونكه پایه‌ی سه‌ره‌كیی ئیمان و كاكڵه‌كه‌ی، بریتیه له خۆشویستن و قبووڵكردن و ته‌سلیم بوونی دڵ و ده‌روون، وه‌ك له به‌رگی یه‌كه‌می كتێبی (ئیمان و عه‌قیده‌ی ئیسلامیی...)دا ڕوونمان كردۆته‌وه.

## تەوەری دووەم:
## بەسەرهاتی سەرهەڵدانی سیكۆلاریزم لە ڕۆژئاوا (غرب)دا

هەڵبەتە ئەو بەسەرهاتە، بەسەرهاتێكی زۆر دوورو درێژە، ئەگەر بویستری هەقی خۆی پێ بدرێ و، بە تێرو تەسەلی باس بكرێ[(١)]، بەڵام ئێمە لێرەدا مەودای ئەوەمان نیە، بۆیە زۆر بە كورتیی و گوشراویی دەڵێین:

خوای بەرزو مەزن (عزوجل) هەر لە سەرەتای نیشتەجێ كردنی باب و دایكی مرۆڤایەتیی (ئادەم و حەووا)یەوە لەسەر زەمین، گفتی پێدان كە ڕێنمایی (هدایة) خۆییان بۆ بنێرێ، تاكو بەر پێی خۆیانی پێ ببینن و، بزانن چۆن بژین و بەڕێوە بچن، وەك فەرموویەتی:

﴿ قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ ﴾ طـه.

واتە: "خوا" فەرمووی: هەردووك لاتان {ئادەم و حەووا، وە ئیبلیس} لێی دابەزن {لە ئاسمان یان لە بەهەشت} هەندێكتان دوژمنی هەندێكتانن، ئنجا هەر كات لە منەوە ڕێنماییتان بۆ هات، ئەوە هەر كەس شوێن ڕێنمایی من بكەوێ، هەرگیز نە گومڕا دەبێ و نە ژیانتاڵیش دەبێ.

---

(١) لە كتێبی: (چەند مەسەلەیەكی باوی سەردەم)دا ئەو سەر گوزشتەیەم گێڕاوەتەوە، شایانی باسیشە: ئەو كتێبە بۆ هەر كام لە زمانەكانی: عەرەبیی و فارسیی و توركیش وەرگێڕراوە.

ئیدی پێغەمبەرانی خوا (علیهم السلام) بە مەشخەڵی ڕێنمایی و بەرنامەی خواوە، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك بە دوای یەکدا هاتن، وەك خوا فەرموویەتی:

١- ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ.. ﴿٣٦﴾ ﴾ النحل.

واتە: وە لە هەموو کۆمەڵگایەکدا، ڕەوانەکراوێکمان ناردوە کە: خوا بپەرستن و خۆتان لە طاغووت دوور بگرن...

٢- هەروەها خوای کاربەجێ فەرموویەتی:

﴿ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ فاطر.

واتە: وە هیچ گەل و کۆمەڵێك نەبووە، کە وریاکەرەوە «پێغەمبەر»ێکی تێدا نەنێررابێ.

تاکو سەرەنجام عیسای کوڕی مەریەم ناسراو بە مەسیح "علیه السلام" بوو بە دوا ئاڵقەی زنجیرەی ئەو پێغەمبەرو ڕەوانەکراوانە (علیهم السلام)، کە خوای زاناو کارزان تەنیا بۆ گەل و کۆمەڵگایەك و، قۆناغێکی دیارییکراو، لە ژیانی بەشەردا، دەیناردن، بەر لەوەی پێغەمبەری کۆتایی (النبی الخاتم) موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبدولموطەلیب "علیه الصلاة والسلام" وەك کۆتایی سەرجەم ڕەوانەکراوانی خۆی، بە دوایین کتێب (قرآن) و، دوایین پەیام و بەرنامەی خۆی، بۆ تێکڕای بەشەر بنێرێ، بە پانایی زەمین و بەدرێژایی زەمان.

بەڵێ، عیسای کوڕی مەریەمیش وەك تێکڕای پێغەمبەرانی دیکە "جگە لە موحەممەد علیه الصلاة والسلام" تەنیا بۆ گەل و کۆمەڵگایەکی دیارییکراو نێررا بوو، کە گەلی بەنی ئیسرائیل بوو، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ إِنِّي رَسُولُ اللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ

مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِى مِنۢ بَعْدِى ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ..﴿٦﴾ الصف.

واتە: یاد بکەوە، کاتێك عیسای کوڕی مەریەم گوتی: ئەی وەچەی ئیسرائیل! من ڕەوانەکراوی خوام بۆ لاتان، تەوراتی پێش خۆم بەڕاست دادەنێم، وە موژدەش "تان پێ" دەدەم بە پێغەمبەرێك، کە ناوی ئەحمەدە، دوای من دێ..

کەواتە: شتێکی سروشتیی و چاوەڕوانکراو بووە، کە پەیام و بەرنامەکەی عیسا (علیه السلام) ئەگەر گریمان وەك خۆیشی مابایەوە، دەستکارییش نەکرابایە، ژیانی بەشەری بە گشتی و پاش سەدان ساڵ دوای هاتنی عیسا، پێ بەڕێوەنەچێ!

ئنجا عیساو شوێنکەوتوانیشی بەردەوام لەلایەن ڕۆمەکانەوە، بە هاندان و دەسیسەی جوولەکەکان، دەچەوسێنرانەوەو دەکوژران و ڕاوەدوو دەنران، هەتا ئەو کاتەی، کە (قسطنطین)ی پادشای ڕۆم (٢٨٠ - ٣٣٧ ز)، بوونە مەسیحیی خۆی ڕاگەیاندو، لە کۆبوونەوەی نیقییە (مجمع نيقية)ی ساڵی (٣٣٥ ز)دا بە فەرمیی پشتگیریی سێکوچکەی (ثالوث)ی (الله، الإبن، الروح القدس)، (خوا، کوڕ، گیانی پیرۆزی) کرد، لە نێو بیروبۆکەو بیرورا جیاوازو پێکەوە ناکۆکەکانی نەصرانییەکاندا، کە یەکێك لە مێژوو زانان لەوبارەوە جوانی گوتوە: (تَرَوَّمَتِ النصرانية، ولم تَتَنَصَّرِ الروم)، واتە: نەصرانییەت بوو بە ڕۆمانیی و، ڕۆم نەبوون بە نەصرانیی!

ئنجا لەوە بە دوا، کە نەصرانییەتی دەستبەردار بوو لە خوا بە یەکگرتن (النصرانية المتنازلة عن التوحيد) دەستی لە کورسی دەسەڵات گیر بوو، دەستی کرد بە دامەزراندنی کڵێسا (كنيسة) و چینی پیاوانی ئایین (ئەکلیرۆس) سەری هەڵداو، دەستەڵاتی پاپاو قەشەکان پەرەی ستاندو لە ڕووی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە، کڵێسا لە کەوڵی خۆی دەرچوو، وە سەرەنجام لە سەرجەم وڵاتانی ئەورووپادا، سیستمی (ثیۆکراسیی theocracy) یانی حوکمی خوایی،

یان حكوومەتی ئایینی[١]، تەبەننیی كراو، بەرنامە ڕاست و ساغەكەی مەسیح (علیه السلام) بە تەواویی كاڵ بۆوە، بگرە لە بنەڕەتەوە گۆڕاو، ئایینێكی دیكە كە (بولس الرسول) داینابوو، پاشان پاپایەكان و "چینی ئەكلیرۆس" زیاتریان خستە سەری، شوێنی گرتەوە.

## سەرنجدانێكی ئایینی كڵێسا:

ئێستاش با سەرنجێكی خێرا لەو ئایینەی كڵێسا بدەین، كەچی بووەو چۆن بووە؟! تاكو بزانین بۆچی خەڵكی ڕۆژئاوا لە دەستی ڕایانكردو، پەنایان بۆ سیكۆلاریزم برد؟!

ئێمە لە شەش خاڵاندا بە كورتی، هەوڵی ناساندنی ئەو ئایینەی كڵێسا دەدەین، كە بە ناهەق ناوی لێنرابوو (ئایینی مەسیح):

**١- گۆڕین و دەستكاریی كردنی كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس):**

دیارە مەبەستمان لە كتێبی پیرۆز (Holy Book) هەر كام لە پەیمانی كۆن (العهد القديم) و پەیمانی نوێ (العهد الجديد)ە، ئنجا هەر كام لەو دوو كتێبە، زۆر بە بێڕەزایی دەستكاریی كراون و گۆڕراون و، هەر كەسێك بیانخوێنێتەوە، هیچ سەرسوڕمانی نامێنێ، كە بۆچی خەڵكی ڕۆژئاوا، هەتا توانیویانە لەچنگ ئەو ئایینە ڕایان كردووە؟

ئنجا هەڵبەتە ئێمە لێرەدا دەرفەتی ئەوەمان نیە زۆر لەوبارەوە بدوێین[٢] و، تەنیا

---

(١) بە داخەوە زۆرێك لە عەلمانییەكان، ناتوانن حكوومەتی ئیسلامیی و، حكوومەتی ئایینی لە یەك جیابكەنەوە، لە حاڵێكدا كە بەینیان ئاسمان و ڕێسمانە، چونكە: حكوومەتی ثیۆكراسیی، حوكمڕان بە پەرستراو (إله)، یان نوێنەرو سێبەری خوا دادەنێ، بەڵام لە ئیسلامدا حوكمڕانان وەكیلی خەڵكن، هەروەها لە ئیسلامدا بەرپرسان پابەندی شەریعەتن، بەڵام لە سیستەمی ثیۆكراسیی دا ئیرادەی حوكمڕانان سەرچاوەی یاسایەو .. هتد.

(٢) لە مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) لە بەرگی سێیەمدا، كە لە چاپی دووەمی دا دەبێتە (الكتاب الخامس) هەڵسەنگاندنێكی باشم بۆ هەردووك كتێبی:

سێ نموونە لە قسە بێ سەروبەرەكانی ئەو كتێبە دێنینەوە:

**یەك: لووط و دوو كچەكەی:**

لە پەیمانی كۆن[١]، سیفری تەكوین، ئیصحاحی: ١٩ دا، هاتوە، كە دوای ئەوەی لووط پێغەمبەر (علیه السلام) و دوو كچەكەی دەربازیان بوو، لەو بەڵایەی بەسەر گەلەكەیاندا هات، هەردووك كچەكە "بە بیانووی وەچەخستنەوە" بابیان بە شەراب سەرخۆش دەكەن و، پاشان بە نۆرە زینای لەگەڵدا دەكەن!!

**دوو: داوودو ئۆریا:**

لە پەیمانی كۆن[٢]، سیفری صەموئیلی دووەم، ئیصحاحی: ١١ دا، هاتوە، كە گوایە داوود پێغەمبەر (علیه السلام) لە حاڵێكدا كە سەد ژنی بووە! چاوی لەهاوسەری (ئۆریا) دەبێ لە كاتی خۆ شۆردنداو تەماعی تێدەكات و، لە دوای دەنێرێ و، زینای لەگەڵ دەكات، دواتریش ئۆریای مێردی دەنێرێتە پێشەوەی بەرەكانی جەنگ، تاكو سەرەنجام دەكوژرێ و، ئەویش ژنەكەی مارە دەكاتەوە!!

**سێ: زۆران گرتنی یەعقووب لەگەڵ خوادا:**

هەروەها لە پەیمانی كۆن[٣]، لە سیفری تەكوین، ئیصحاحی: ٣٢ دا، هاتوە، كە یەعقووب شەوێك لە شوێنێك بە ناوی (فنیئیل) لەگەڵ خوادا ملانە (زۆران)ی گرتوە، هەتا بەری بەیانی یەكدییان هێناوەو بردووە، پاشان خوا جومگەی ڕانی یەعقووبی لە جێ بردووە، پێی گوتوە: بەرمبدە، ڕۆژ بۆوە! یەعقووبیش گوتوویەتی: هەتا بەرەكەتم نەدەیە بەرت نادەم! ئیدی سەرەنجامیش خوا بەرەكەتی پێداوە!!

---

پەیمانی كۆن و، پەیمانی نوێ كردوە، زۆر نموونەم لە هەڵەكانیان هێناوەتەوە.

(١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ١٩، ص٥٢ و ٥٣.

(٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر صموئيل الثاني، الإصحاح: ١١، ص٦٥٩ و ٦٦٠.

(٣) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التكوين، الإصحاح: ١١، ص٨٧، ٨٨.

پێم وایە ئەو سێ نموونەیەش بەسن، بۆ سەلماندنی ئەو قسەیە، کە دەڵێ: ئەوەی پێی دەگوترێ: (کتێبی پیرۆز) لە لای جوولەکەو نەصرانییەکان، هیچ گومان لە گۆڕان و دەستکاریی کرانییدا نیەو، سەدان شتی وای تێدایە، کە بە هیچ جۆرێك، هیچ مرۆڤێکی خاوەن عەقڵ و سروشتی ساغ قبووڵی ناکات و ناتوانێ بە فەرموودەی خواو وەحی و پەیامی خوای دابنێ!

**٢- لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە:**

لە ڕووی عەقیدەیی و فیکرییەوە، ئایینی کڵێسا کۆمەڵێك لادان (إنحراف)ی زل زلی تێدا پەیدا کران، کە ئەم حەوتە، سەرەکییەکانیان بوون:

١- تەبەنیی کردنی فەلسەفەی ئەرستۆ لە بارەی خواوە، کە دەیگوت: خوا بوونەوەری وەك کاتژمێر (سعات)ێك دروستکردوەو وەگەڕ خستوەو، وازی لێهێناوە!

٢- تەبەنیی بیرۆکەی: سێ پەرستراویی (تثلیث) کە دەڵێ: بە (باب و کوڕو گیانی پیرۆز) (الأب والإبن والروح القدس) خوا پێك دێنن!

٣- بە بەشێك و بگرە بناغەی ئایین لە قەڵەم دانی، لە خاچدرانی عیسا، بۆ سڕینەوەی گوناهەکانی شوێنکەوتوانی.

٤- پسوولەی لێخۆشبوون (صکوك الغفران) دابەش کردن بەسەر خەڵکدا، کە گوایە پاپاو قەشەکان نوێنەری خوان، بۆ لێبوردنی گوناهی خەڵك!

٥- دروستکردنی چینی ئەکلیرۆس (طبقة الکهنوت) کە هەر ئەوان بۆیان هەیە، باسی ئایین بکەن و، کتێبی پیرۆز لێك بدەنەوە!

٦- بە سێبەرو نوێنەری خوا دانانی پاپایەکان، پاشان حوکمڕانەکان.

٧- بە بەشێك لە ئایین لە قەڵەم دانی فیکرەکانی: ئیقلیدس و بەتلیمۆس و جالینۆس، کە هەڵبەتە دواییش بە ئیسپات بوونی هەڵەیی و ناتەواویی یان، کۆی ئایینی ئەو کڵێسانەش کەوتە ژێر نیشانەی پرسیارەوە!

بۆ وێنە: كاتێك كۆپەرنیكۆس (١٤٧٣ - ١٥٤٣)، سەلماندی، كە زەوی خڕەو دەخولێتەوە، ڕیسی كلێساو پاپاو كەهەنووت بۆوە بە خوریی!

٣- دانانی دادگاكانی پشكنینی عەقیدە (محاكم التفتيش عن العقيدة):

لە ساڵی (١١٨٣ ز)ەوە كلێساو پیاوەكانی، هەڵساون بە دانانی دادگایەكانی پشكنین و سانسۆری فیكرو عەقیدە، وە لەو ماوەیەدا، كە كلێسا دەستەڵاتی هەبوو، دەوری سێسەد هەزار (٣٠٠،٠٠٠) كەس دادگایی كراو سزادراون و، دەوری سی و دوو هەزار (٣٢٠٠٠) كەس بەس بە سووتێنران، سزادران، كە لەنێویاندا هەر كام لە:

١- جیوردانۆ برنۆ: ١٥٤٨ - ١٦٠٠.
٢- جیو فری فالیە: ١٥٧٤.
٣- بومبو نیو راستنیكو: ١٥٨٧.
٤- ئیدوارد وایتمان: ١٦١٢ هەبوون.

(گالیلۆ)ش لە ساڵی (١٦٤٢) تۆبەی پێكرا، ئەگەرنا بە مەرەدی ئەوان دەچوو!

وە (دی روزا) لە كتێبی (مێژووی ڕەشی كلێسا)دا، گوتوویەتی: تەنیا لەئیسپانیا، سی هەزار (٣٠٠٠٠) كەس سووتێنران!

٤- تەبەننیی كردنی سیستمی ثیۆكڕاسیی (theocracy):

لەلایەن كلێساو چینی ئەكلیرۆسەوە، لە هەموو ئەورووپادا سیستمی حكومەتی خوایی، یان حكومەتی ئایینی (ثیۆكراسیی) تەبەننیی كراو سەرەنجام:

سێكوچكەیەكی شووم (ثالوث مشئوم) لە:

پاپا، پادشا، دەرەبەگ (البابا، الملك، الإقطاعي) دروست بوو، كە ملۆزمێكی خوێنمژو كابوسێكی بێرەزا بوون، بۆ گیانی خەڵك و جەماوەر.

**٥- قۆرخکارییەکی سەختی موڵك و سامان:**

کڵێساو پیاوەکانی، بە پێچەوانەی ئەوەوە کە بانگەشەیان بۆ دەکرد، کە بریتی بوو لە ژیانی ڕەبەنایەتیی (الرهبانية)و پشت لە دنیا کردن، باوەشیان بە دنیاو پارەو ساماندا کردبوو و، باج و خەراج و پیتاکی زۆریان بە ناوی خواو مەسیح و کڵێساوە، لە خەڵك دەستاند.

**٦- تێکچوونی ئاشتی کۆمەڵایەتیی:**

دوای ئەوەی هەر کام لە جووڵانەوەی: ١- مارتن لوثەر ١٤٨٣ز - ١٥٤٦ لە ئەڵمانیا، ٢- جووڵانەوەی کالڤن: ١٥٠٩ - ١٥٤٤ لە فەرەنسا، سەریان هەڵدا، وەك کاردانەوە بۆ کڵێساو دارو دەستەکەی، شەڕو کوشتارێکی بێ ئامان، باڵی ڕەشی بەسەر ئەوروپادا کێشا، لە نێوان هەرسێك ڕەوتی:

أ- کاثۆلیك .
ب- پرۆتستانت .
ج- ئەرثذۆکس .

وە لەو شەڕو کوشتارانەدا، کە هەیانبووە سەد (١٠٠) ساڵ و، هەیانبووە سی (٣٠) ساڵ بەردەوام بووە، ملیۆنان خەڵك کوژراون!

**ئیدی سەرەنجام:**

١- کڵێسا عەقڵ و هۆشی بیرمەندانی کۆت و زنجیر کرد بوو، تاکو لە ئەنجامی بیرکردنەوەی ئازادانەیانەدا، بیرۆکە ئەفسانییەکانی ئاشکرا نەبن!

٢- هەروەها کڵێسا دڵ و دەروونی خەڵك و جەماوەری بە ناوی چینی کەهەنووتەوە، زەوت کردبوو!

٣- پاپاو قەشەکان و چینی ئەکلیرۆس، خۆیان لە خەڵکی کردبوو بە سێبەرو وەکیلی ڕەهای خوا!

٤- ژیان تووشی وەستان بوو بوو و، دژایەتیی هەر جۆرە داهێنان و تازەگەرییەك دەکرا.

٥- کلێسا خەڵکی هان دەدا بۆ گۆشەگیریی و، واز هێنان لە دنیا و ژیانی ڕەبەنایەتیی، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿... وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ ...﴿٢٧﴾﴾ الحديد.

واتە: ڕەبەنایەتییەکیان داهێنا، کە لەسەرمان پێویست نەکردبوون..

٦- وە کلێسا بوو بوو بەبەشێك لەسێکوچکەی سیستمی ستەمکارانەی ثیۆکراسیی (پاپا، پادشا، دەرەبەگ).

## ڕاپەڕینی بیرمەندان و پاشان خەڵك و جەماوەر لە کلێساو ئایینەکەی

ئنجا سەرەنجام لە بەرانبەر ئەو هەموو هەڵەو پەڵەو لادان و تاوانانەی کلێسادا، بیرمەندان و خەڵك و جەماوەریش بەگشتی، تەواو بێزارو نیگەران بوون و، دەستیان بە جموجۆڵ و کاردانەوەی جۆراو جۆر کرد:

### یەك: مارتن لۆثەر ١٤٨٣ - ١٥٤٦:

سەرەتا لە ئەڵمانیا (مارتن لوثەر) جووڵانەوەی (پرۆتستانت)یی ڕاگەیاند، کە زیاتر وەك ڕەخنەگرتن لە کلێساو بەرگریی کردن لە ئایینی ڕاستەقینەی مەسیح، خۆی دەنواند.

دەشتوانین نێوەڕۆکی جووڵانەوەی (پرۆتستانت)یی، لەم پێنج بنەمایەدا پوخت بکەینەوە:

١- تاك ئازادە، کتێبی پیرۆز بخوێنێتەوە.

٢- کەهانە نیەو نهێنیی پیرۆز، کە تەنیا چینی ئەکلیرۆس بیزانن، بوونی نیە.

٣- تاك بۆی هەیە ڕاستەوخۆ خوا بپەرستێ.

٤- لە دەرەوەی جوغزی کلێساش، ڕێی لە دۆزەخ دەرباز بوون و ڕازییکردنی خوا هەیە.

٥- تێگەیشتنی عەقڵانە لە کتێبی پیرۆز، ڕەوایەو گوناه نیە.

دوو: کاڵفن: ١٥٠٩ - ١٥٤٤:

ئەمیش لە فەڕەنسا لە کڵێساو ئەفسانەکانی و تاوانە و لادانەکانی ڕاپەڕی، کە تێڕوانینەکانی زۆر لە هی (مارتن لۆثەر)ەوە نیزیك بوون.

سێ: شۆڕشی فەڕەنسا (١٧٨٩ ز):

وە لە ئاکامدا شۆڕشی فەڕەنسا، لە ساڵی: (١٧٨٩ ز) ڕوویدا، کە یەکێك لە دروشمەکانی ئەوە بوو:

"دوا پادشا بە ڕیخۆڵەی دوا قەشە ئیعدام بکەن"

ئنجا لەوە بە دوا، کە پێشتر سیکۆلاریزم (Secularism) وەك تیۆرو بیرۆکە هەبوو، ئەمجارە حاڵەتی کردەیی و پراکتیزە کردن (تطبیق)ی بەخۆیەوە بینی و، گۆڕا بۆ سیکۆلاریزەیشن (Secularization) واتە: بە عەلمانیی کردن (العلمنة).

وە بیرۆکەی سیکۆلاریزم و حاڵەتی سیکۆلاریزەیشن، وەك چۆن ئاگر لە پوشی بەردەبێ، ئاوا بە خێرایی سەرجەم وڵاتانی ئەورووپای گرتەوە.

## تەوەری سێیەم:



## سیکۆلاریزم لە کۆمەڵگایەکی لە ئیسلام تێگەیشتوودا، پاساوی بوونی نیە

بەڕێزان!

ئێمە لە دوو خاڵاندا بە کورتیی و گوشراویی، ڕاستیی ئەو قسەیەی سەرێ، کە کردوومانەتە ناوونیشانی ئەم تەوەری سێیەمە، دەسەلمێنین:

**خاڵی یەکەم: مێژووی ئیسلام و مسوڵمانان، پێچەوانەی مێژووی کڵێساو نەصڕانییەکانە:**

١- عیسا (علیه السلام) بۆ گەلێکی تایبەت (بنو إسرائیل) و قۆناغێکی دیاریکراو، هاتبوو، "وەك پێشتر گوتمان" بەڵام ئیسلام بۆ سەرجەم مرۆڤایەتیی هاتوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ سبأ.

واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ تێکڕای خەڵکی، مۆژدەدەرو ترسێنەربی.

کەواتە: ئەگەر ئایین و بەرنامەکەی عیسا (علیه السلام)، کە بۆ کۆمەڵگایەکی تایبەتیی، دەوری دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر نێرراوە، نەتوانێ "بە ساغیی و سەلامەتییش، چ جای دوای گۆڕان و دەستکاریی کران" کێشەو گرفتەکانی

كۆمەڵگایەكانی دوای خۆی چارەسەر بكات، هیچ ماقووڵ نیە ئیسلامێكی دەستكاریی نەكراوی بۆ هەموو مرۆڤایەتیی نێرراوی، قیاس بكرێتە سەر!

٢- كتێبەكەی عیسا (علیه السلام) زۆری دەستكاریی كراوەو گۆڕراوە، چونكە خوا یەك ئینجیلی بۆ مەسیح (علیه السلام) ناردوە، بەڵام ئێستا نەصرانییەكان چوار ئینجلیان لەبەر دەستن (مَتَّى، يُوحَنَّا، لُوقَا، مرْقَصْ)، كە ئەوانیشیان لە نێو دەیان ئینجیلدا هەڵبژاردون،

بەڵام قورئان نەك وشەیەك، پیتێكیشی نەگۆڕراوەو، لەلایەن خواوە پارێزراوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ۝٩ ﴾ الحجر.

واتە: ئێمە خۆمان زیكرمان ناردۆتە خوارو، هەر خۆیشمان پارێزەرینی.

لەبارەی گۆڕران و دەستكاریی كرانی ئایینی عیساوە، لەسەر دەستی كڵێسا، (جرين برنتن) لە كتێبی: (أفكار ورجال)[1] لە لاپەڕە (٢٠٧)دا دەڵێ: (بێگومان مەسیحییەتی زاڵبوو لە كۆبوونەوەی (نيقية)دا "٣٣٥" كە كرا بە ئایینی گەورەترین ئیمپڕاتۆریەتی دنیا، بە تەواویی جیا بوو لە مەسیحییەتێك، كە مەسیحییەكانی جەلیل "بەڕێوەیان دەبرد").

٣- نەصرانییەكان هەتا دەستگرتوو بوون بە ئایینە شێوێنراوەكەیانەوە، دواكەوتوو بوون، كە دەستبەرداری بوون، پێشكەوتن، بەڵكو مسوڵمانان، بە پێچەوانەوە: هەتا دەستگرتوو بوون بە ئایینەكەیانەوە، لە پێشەوە بوون و، كە دەستیان لە ئیسلام شل كرد، كەوتنە دوا!

٤- لە مێژووی مسوڵمانانیشدا هەڵەو لادان بووە، بەڵام بەهۆی لادانی حوكمڕانانەوە بوە لە ئیسلام و قورئان، بەڵام لادانی نەصرانییەكان، لە خودی ئایینە تێكدراوو كتێبە گۆڕراوەكەیانەوە، سەرچاوەی گرتبوو.

---

(١) هەڵبەتە كتێبەكەی تەرجەمەی عەرەبی كراوە.

**خاڵی دووەم: هیچ كام لەو هۆكارانەی كە خەڵكی ڕۆژئاوایان لە كڵێساوە سڵەماندووە، لە ئیسلامدا بوونیان نیە:**

**١- لە ڕووی عەقیدەیی و فیكریی و زانستییەوە:**

١- بە هۆی پارێزرانی قورئانەوە لە گۆڕران، لەلایەن خوای تواناوە، ڕێ لە لادانی عەقیدەیی و فیكریی گیراوە:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر.

٢- یەكەمین ئایەتی قورئان كە دابەزی بە: بخوێنە (إقرأ) دەستی پێكرد:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ ﴾ العلق.

وە موعجیزەی پێغەمبەری خاتەم صەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێ، موعجیزەیەكی فیكریی و زانستییە، كە قورئانە.

٣- لە ئیسلامدا: دین و ژین، حوكم و حیكمەت، سیاسەت و عیبادەت، دنیاو دوارۆژ.. تێكهەڵكێش و ئاوێتەن.

٤- ئیسلام لە ڕووی بوونناسیی (Ontology) و عەقیدەیی یەوە: مسوڵمانانی بێ نیازو دەوڵەمەند كردووە، لە ڕووی دنیادارییشەوە: دەستی كردوونەوەو، بگرە لەسەریشی پێویست كردوون، كە هەم عەقڵ و هۆشی خۆیان ئازایانەو ئازادانە بەكاربێنن، هەم حیكمەت و زانیاری بەسوود لە هەر كەسێكەوە بێ، وەری بگرن:

﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَٰئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر.

واتە: ئنجا مۆژدە بدە بەو بەندانەم كە گوێ بۆ هەموو قسەیەك ڕادەدێرن، پاشان شوێن باشترینی دەكەون، ئا ئەوانەن، كە خوا ڕێنمایی كردوون، وە هەر ئەوانەشن خاوەن عەقڵان.

٥- قورئان فەرمانی بە مرۆڤ كردوە، كە سەرنجی دیاردەو دیمەنە سروشتییەكان بدات و، پەی بە نهێنییەكانیان ببات:

- ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ ﴾ الطارق.

واتە: با مرۆڤ سەرنج بدات، لە چی دروست كراوە!

- ﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَىٰ طَعَامِهِ ﴿٢٤﴾ ﴾ عبس.

واتە: با مرۆڤ سەرنجی خواردنەكەی بدات!

- ﴿ أَوَلَمْ يَنظُرُوا فِي مَلَكُوتِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ مِن شَيْءٍ .. ﴿١٨٥﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: ئایا تەماشای موڵكی فراوانی ئاسمانەكان و زەوی و، هەر دروستكراوێكی دیكەی خوایان نەكردوە؟!

- ﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ .. ﴿٢٠﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: بڵێ: بە زەویدا بڕۆن، سەرنج بدەن چۆن (خوا) دروستكراوەكانی دەست پێكردوون!

٦- زاناو شارەزایان بەگشتی، پلەو پایەو ڕێزی تایبەتییان هەیە، بەڵام هیچ ماف و ئیمتیازێكیان بەسەر خەڵك و جەماوەرەوە نیە، لە ڕووی بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیاریی كۆمەڵگاوە:

- ﴿ .. قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ .. ﴿٩﴾ ﴾ الزمر.

واتە: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن و ئەوانەی نازانن، یەكسانن؟!

- ﴿ .. يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ .. ﴿١١﴾ ﴾ المجادلة.

واتە: خوا ئەوانەتان كە بڕوایان هێناوە، بەرز دەكاتەوە، وە ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، بە چەندان پلە بەرزیان دەكاتەوە.

- ﴿ .. إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا۟.. ﴿٢٨﴾ ﴾ فاطر.

واته: بێگومان ته‌نیا به‌نده زاناكان "وه‌ك پێویست" به‌ به‌ گه‌وره‌ گرتنه‌وه‌ له‌ خوا ده‌ترسن.

٢- له‌ ڕووی ژیــان و گوزه‌رانــه‌وه‌:

١- خوای به‌رزو مه‌زن، له‌ چه‌ندان ئایه‌تی قورئاندا، ڕایگه‌یاندوه‌، كه‌ هه‌رچی له‌ بوونه‌وه‌ر دایه‌، بۆ مرۆڤی ڕام و ده‌سته‌ مۆكردوه‌:

أ- ﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ لَكُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا .. ﴿٢٩﴾ ﴾ البقرة.

ب- ﴿ وَٱلْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ ﴿١٠﴾ ﴾ الرحمن.

ج- ﴿ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ ﴿١٣﴾ ﴾ الجاثية.

٢- هه‌روه‌ها خوای كارزان ڕایگه‌یاندوه‌، كه‌ مرۆڤی به‌مه‌به‌ستی ئاوه‌دان كردنه‌وه‌ی دنیا له‌سه‌ر زه‌وی داناوه‌:

﴿ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ ﴾ هود.

٣- وه‌ خوا ستایشی ئه‌وانه‌ی كردوه‌، كه‌ به‌ر له‌ چاكه‌ی دواڕۆژ، چاكه‌ی دنیا، له‌ خوا داوا ده‌كه‌ن:

﴿ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾ ﴾ البقرة.

**شایانی باسیشه‌:** هه‌موو ئه‌و ئایه‌تانه‌ی كه‌ زه‌مكردنی ژیانی دنیایان تێدایه‌، به‌سه‌رنجدانی سیاقه‌كه‌یان، ده‌زانرێ كه‌ مه‌به‌ست ئه‌و ژیانه‌ دنیاییه‌ یه‌، كه‌ خاوه‌نه‌كه‌ی به‌هۆیه‌وه‌، ڕۆژی دوایی له‌ بیر ده‌كات، بۆ نموونه‌:

﴿ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾ الأنعام.

واتە: وە ژیانی دنیا بەس یاریی و خافڵانە، وە مەنزڵگای دواڕۆژ باشترە، بۆ ئەوانەی پارێز دەکەن، ئایا نافامن؟!

ئەگەرنا بێگومان ژیانی دنیا، کە خوا ئەو هەموو هەزاران پێغەمبەرەی خۆی ناردبێ و، ئەو هەموو کتێبانەی خۆی دابەزاندبێ، بۆ چاککردن و ڕێك و پێککردنی، دیارە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، ئەوپەڕی گرنگیی و بایەخیی پێدراوە.

**٣- لە ڕووی سیاسییەوە:**

١- خەڵك و کۆمەڵگا بە گشتی، خاوەنی ئەسڵیی حوکم و دەستەڵاتی سیاسی و حوکمڕانییە، بە بەڵگەی ئەوە کە سەرجەم دواندنەکانی (خطابات)ی قورئان، ڕوویان لە خەڵك و کۆمەڵگایە بە گشتی، نەك چین و توێژێکی تایبەت:

أ- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴿١﴾ ﴾ النساء.

ب- ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴿١﴾ ﴾ الحجرات.

وە تەنانەت بۆ جارێکیش خوای بەرزو مەزن، زانایان (علماء) یان بەرپرسان (مسؤلین) یان بە تەمەنان (شیوخ) . هتدی، نەدواندوون!

٢- ڕاوێژ (شوری) بناغەی حوکمڕانیی و کاروبار بەڕێوەبردنە، وەك خوای عزوجل فەرموویەتی:

﴿ ...وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ... ﴿٣٨﴾ ﴾ الشوری.

واتە: وە کاروبار بەڕێوەبردنیان (هی مسوڵمانان) بە ڕاوێژە.

٣- حوکمڕان و بەرپرسان وەکیلی خەڵك و کۆمەڵگان، نەك هی خوا، وە ڕەوایەتیی (شرعیة) لە خەڵك وەردەگرن، نەك لە خوا، وەك دوایی لە کاتی بەراورد کردنی سیستمی حوکمڕانیی لە ئیسلامداو، دیموکراسییدا، باسی دەکەین.

٤- زاناو شارەزایان پلەو ڕێزی تایبەتیان هەیە، بەڵام چینێکی تایبەتی خاوەن ماف و ئیمتیازی سیاسی نین، وەك چینی ئەکلیرۆس!

وە بێگومان له ئیسلامدا، سەرپەرشتیاریێتیی ڕاوێژ (ولاية الشورى) هەیە، نەك سەرپەرشتیاریێتیی شەرعزان (ولاية الفقيه)، وە ئەو جۆرە له حوکمڕانیی، بەسروشتی ئیسلام نامۆیەو، دووبارە کردنەوەی ئەزموونی ئاینی کڵێساو، حوکمی پاپایەکانی ڕۆژئاوایە له سەدەکانی نێوەڕاستدا، وە نابێ ئەو جۆرە حوکمڕانییە، کە زۆر له حکوومەتی ئاینی و خوایی (ثیۆکراسیی) بەوە نیزیکە، لەسەر ئیسلامی بەرجەستە له قورئان و سوننەتدا حیساب بکرێ، چونکە وەك پێشتر گوتمان:

له ئیسلامدا خاوەنی ئەسڵیی دەسەڵات (صاحب السلطة الأصلي) خەڵك و جەماوەرە بە گشتی، هەر بۆیەش خوا فەرمان بە کۆمەڵگا دەکات، کە سپاردەکانی حوکمڕانیی و بەرپرسیاریێتیی، بە کەسانی شایستە بسپێرن، وەك فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ...﴿٥٨﴾﴾ النساء.

هەروەها بناغەی حوکمڕانیی و کاروباری خەڵك و وڵات بەڕێوەبردن، ڕاوێژە:

أ- ﴿...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴿٣٨﴾﴾ الشورى.

ب- ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران.

٤- له ڕووی ئابوورییەوە:

کۆتا کتێبی بەهێزو پیرۆزی خوا (قورئان) زۆر بە ڕوونیی ڕایگەیاندوە، کە خوای کاربەجێ نازو نیعمەت و خێرو بێرەکانی زەمینی، بەبێ جیاوازیی بۆ سەرجەم مرۆڤەکان هێناونە دی:

أ- ﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ..﴿٢٩﴾﴾ البقرة.

واتە: "خوا" ئەو کەسەیە کە هەرچی له زەوی دایە، بۆ تێکڕاتانی دروست کردوە.

ب- ﴿وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ﴿١٠﴾﴾ الرحمن،

واته‌: وه‌ "خوا" زه‌مینی بۆ مرۆڤه‌كان داناوه‌.

كه‌واته‌: هیچ كه‌س بۆی نیه‌، قۆرخكاریی له‌ خێرو بێره‌كانی سه‌ر زه‌ویدا بكات و، هیچ كه‌س و بنه‌ماڵه‌و تیره‌و هۆزو گه‌لێك، له‌ كه‌س و بنه‌ماڵه‌و تیره‌و هۆزو گه‌له‌كانی دیكه‌، پتر پشك و به‌شی به‌ هیچ شتێكه‌وه‌ نیه‌.

وه‌ له‌ ڕاستییدا ئیسلام: لایه‌نه‌ ئه‌رێنییه‌كانی هه‌ر كام له‌ (سوسیالیزم) و (كاپیتالیزم)ی تێدان و، له‌لایه‌نه‌ نه‌رێنیی (سلبي)یه‌كانیشیان به‌رییه‌.

### ٥- له‌ ڕووی كۆمه‌ڵایه‌تییه‌وه‌:

١- ئیسلام ئایین و به‌رنامه‌یه‌كی له‌گه‌ڵ سروشت و فیترەتدا گونجاوه‌، هه‌رچی سروشتی ساغی مرۆڤ داوای ده‌كات، گرتوویه‌ته‌ خۆی، وه‌ك خوای زانا ده‌فه‌رمووێ:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الروم.

٢- له‌ ئیسلامدا مرۆڤه‌كان: به‌ نێرومێ و سه‌رجه‌م ڕه‌نگ و ده‌نگ و هۆزو نه‌ته‌وه‌كانه‌وه‌، یه‌كسانن و، به‌ڕێزترینیان، پارێزكارترینیانه‌، وه‌ك خوا فه‌رموویه‌تی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الحجرات.

### ٦- له‌ ڕووی ته‌بایی و پێكه‌وه‌ ژیانه‌وه‌:

هه‌ركات مسوڵمانان به‌ شێوه‌یه‌كی ڕاست و دروست، له‌ به‌رنامه‌كه‌یان تێگه‌یشتبن و، به‌ باشی پێوه‌ی پابه‌ند بووبن، به‌ خه‌سڵه‌تی به‌رزی ته‌بایی و پێكه‌وه‌ ژیان (التسامح والتعایش)ه‌وه‌ ڕازاونه‌وه‌، له‌ بواری مامه‌ڵه‌یان له‌گه‌ڵ ئه‌وانی دیكه‌ "نامسوڵمانان"دا وه‌ هه‌میشه‌ له‌ ده‌مارگیریی و داخراویی (التعصب والإغلاق) دوور بوون، چونكه‌ ئایینه‌كه‌یان بڕوای به‌وپه‌ڕی ئازادیی هه‌یه‌، له‌ بواری بیرو بڕواو ده‌ربڕیندا[1].

---

(١) له‌ كتێبی (چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌كی باوی سه‌رده‌م)دا چاپی شه‌شه‌م و، به‌رگی دووه‌می مه‌وسووعه‌ی: (ئیسلام و ده‌وڵه‌تداریی)دا، به‌ درێژیی باسی ئه‌و مه‌سه‌له‌یه‌مان كردوه‌.

## تەوەری یەكەم:
## پێناسە

دیموكڕاسی (Democracy) واتە: حوكمی گەل، لە هەردووك وشەی یۆنانیی: دەستەڵات (kratos) و گەل (Demos) پێكهاتوە، وەك لە (موسوعة السياسة)دا هاتوە: (الحكم الذي تكون فيه السلطة للشعب) ج٢، ص٧٥١.
واتە: ئەو سیستمەیە، كە تێیدا دەستەڵات هی خەڵكە.

**هەڵبەتە (دیموكڕاسی) بە زۆر جۆر پێناسە كراوە، بەڵام ئێمە حەوت دانەیان بەنموونە لێ وەردەگرین:**

١- **(جون ستراوت میل) دەڵێ:** (باشترین جۆری دەستەڵات ئەوەیە، كە زۆرترین بواری بەشداریی سیاسی بڕەخسێنێ، وە گونجاوترین پەیكەرەی دەستەڵات بۆ كۆمەڵگای سەردەم ئەوەیە، كە نوێنەرایەتیی دەكات). بڕوانە: (حكوومەتی نوێنەرایەتیی / ١٨٦١ لاپەڕە ٣١٤).

٢ - **(جۆزیف شەمپیتەر) دەڵێ:** (سیستمێكی سیاسییە، كە تێیدا كاربەدەستان كێبڕكێ دەكەن بۆ گەیشتن بەدەسەڵات، لە ڕێگای بەدەستهێنانی دەنگی خەڵكەوە، كار بەدەستانی سیاسی، لە ڕێی هەڵبژاردنەكانەوە دیاریی دەكرێن).
بڕوانە: (سەرمایەداریی، سۆشیالیزم، دیموكڕاسی / ١٩٤٣ لاپەڕە ٢٦٩).

٣ - **(ڕۆبێرت دال) دەڵێ:** (سیستمی دیموكڕاتیك، سیستمێكە ڕەوایەتیی لە خەڵك وەردەگرێ، وە مانەوەشی پەیوەستە بە بەردەوامیی ڕەزامەندیی خەڵكەوە).
بڕوانە: (لەبارەی دیموكڕاسی یەوە / ١٩٩٦، لاپەڕە ٨٢).

٤- (کارل پۆپەڕ) دەڵێ: (دیموکڕاسی سیستمێکە، کە هاووڵاتییان تێیدا دەتوانن بەبێ خوێن ڕشتن، کاربەدەستانی خۆیان بگۆڕن) (١٩٦٢ / لاپەڕە ١٢٤).

٥- (ئیان شاپیرۆ) دەڵێ: دیموکڕاسی خوازیارە بۆ کۆمەڵێك دامەزراوە، کە بوار دەڕەخسێنن خەڵك کاربەدەستانیان دابنێن و لاشیان بەرن). (پێگەی دیموکڕاسی ١٩٩٨، لاپەڕە ٣٥).

٦- (فرانسیس فۆکۆیاما) دەڵێ: (دیموکڕاسی سێ شتی پێویستن: دامەزراوەکان، سەروەریی یاسا، لێپرسینەوە). (سیستمی سیاسی و ئاژاوەی سیاسی ٢٠٠٥).

٧- (ئیریك فرۆم) دەڵێ: (بە پێی سیستمی دیموکڕاسی: تێکڕای هاووڵاتییان لە بەرپرسیارێتیی دروستکردنی بڕیاری سیاسییدا، یەکسانن). (٢٠٠٢، لاپەڕە ١٧٩).

منیش دەڵێم:

دەتوانین بڵێین: دیموکڕاسی ئەو سیستمەیە، کە خەڵك مافی هەبێ لە دانانی حوکمڕانان و، ڕەخنە لێگرتنیان و، لابردنیان دا.



## ته‌وه‌ری دووه‌م:
## سه‌رگوزشته‌ی دیموكڕاسی

ئایا ڕاسته‌ "وه‌ك به‌ داخه‌وه‌ له‌ لای زۆربه‌ی خه‌ڵكی دنیا بۆته‌ قه‌ناعه‌ت" كه‌ دیموكڕاسی "یانی: ده‌ستكراوه‌یی خه‌ڵك له‌ دانان و، چاودێریی كردن و، لێپرسینه‌وه‌و لادانی حوكمڕاناندا" سیستمێكه‌ له‌ یۆنانه‌وه‌ هاتوه‌و، بۆ یه‌كه‌مجار له‌وێ پیاده‌ كراوه‌و، كاڵایه‌كی ڕۆژ ئاوایی ڕووته‌؟!

**له‌ وه‌ڵامدا ده‌ڵێین:**

بێگومان ئه‌و بیرۆكه‌یه‌ ڕاست نیه‌، به‌ڵام خۆ به‌ سه‌نته‌ر زانینی ڕۆژئاواو، لێ سه‌لمێنرانی ئه‌وده‌عوایه‌شی، له‌لایه‌ن زۆرێك له‌ گه‌لانه‌وه‌، ئه‌وه‌ وه‌همه‌ی كردوه‌ به‌: ڕاستییه‌كی حاشا هه‌ڵنه‌گر له‌ لای خه‌ڵكێكی زۆر!

من ته‌ماشای كۆمه‌ڵێك كتێبی مێژوویيم كردوه‌، ده‌ری ده‌خه‌ن كه‌ دیموكڕاسی، (نه‌ك وه‌ك ناوه‌كه‌ی، به‌ڵكو وه‌ك نێوه‌ڕۆكه‌كه‌ی، ئه‌وه‌ كه‌ خه‌ڵك به‌رپرسانی خۆیان دابنێن و، بۆشیان هه‌بێ چاودێرییان بكه‌ن و، لێیان بپرسنه‌وه‌و، كه‌ ئه‌وه‌ نێوه‌ڕۆكی دیموكڕاسییه‌)، ئه‌م نێوه‌ڕۆكه‌ شتێكی زۆر له‌مێژینه‌یه‌، به‌م به‌ڵگانه‌ی خواری:

١- ئه‌گه‌ر ته‌ماشای قورئان بكه‌ین، خوای په‌روه‌ردگار، كه‌ باسی شاژنی (سبأ) ده‌كات، ده‌فه‌رموێ:

﴿ قَالَتْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ

ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ ﴾ النمل.

شاژن: گوتی: ئەی مشوور خۆرو بڕیار بە دەستەکان! من نامەیەکی بەڕێزم بۆ نێرراوە، نێوەڕۆکەکەی ئاوایە: ئەمە لە سولەیمانەوەیە، وە بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، لە ئاستم خۆتان بەبەرز مەگرن و، بە ملکەچیی و بێ لام و جیمیی وەرنە لام! گوتی: ئەی کاربەدەستان و مشوورخۆرەکان! ڕاتان چییە؟ تاکو ئێوە بڕیار نەدەن، من هیچ بڕیار نادەم...

وەك دەبینین گەڕانەوە بۆ ڕای خەڵك، گەڕانەوە بۆ نوێنەرانی خەڵك، لە قورئاندا هاتوە، ئنجا نەك لەلایەن بەرپرسێکی پیاویشەوە، بەڵکو لەلایەنی بەرپرسێکی ئافرەتیشەوە، کە شاژنێکە.

٢- (ڕاۆول مانغلابوس) لە کتێبێکیدا، کە بۆ عەرەبی تەرجەمە کراوە بەناوونیشانی (إرادة الشعوب)، دەڵێ: {دیموکراسی بەر لە دەستەڵاتی ڕۆمانەکان، لە باکووری ئەورووپا حوکمی دەکرد، لە نەرویج و دانیمارك و ئایسلەندا}[1].

٣- هەروەها هەر (مانغلابوس) لە هەمان کتێب لاپەڕە (١٣٣)دا دەڵێ: {لە نێو هیندیە سوورەکانی ئەمریکاش دا، دیموکراسی (وەك نێوەڕۆك) هەبووە، بەهەڵبژاردن خەڵك بەرپرسانی خۆیان داناوە، وە بە زمانی خۆیان (ساخیم)یان پێ گوتوە}.

٤- هەروەها هەر (مانغلابوس) لە هەمان کتێب لە لاپەڕە (٤٠ - ٢)دا دەڵێ: لە وڵاتی میزۆپۆتامیا (ما بین النهرین)دا، پێش (٤٥٠٠) ساڵ بەر لە ئێستا، ئەم سیستەمە باو بووە، بە تایبەتی لە شاری (ئیبلا) کە دانیشتوانی سی هەزار (٣٠٠٠٠) کەس بوون و، دوازدە هەزار (١٢٠٠٠) کارمەندی هەبوون، وە وڵاتێکی دوو سەدو پەنجا هەزار (٢٥٠٠٠٠) کەسیی بووە.

---

(١) إرادة الشعوب، قبرص/ ١٩٩١م، ص١٨.

٥- هەروەها (ئیف شمیل) لە کتێبی: (السیاسة في الشرق القدیم) لە لاپەڕە (٤٢ و ٤٣)دا، وە (صاموئیل نوح کریم) لە کتێبی: (تأریخ سومر) لە لاپەڕە (٦١)دا دەڵێن: {سێ هەزار (٣٠٠٠) ساڵ پێش زایین، لەو ناوچانە (نێوان دوو ڕووبارەکان)دا کۆماڵگایەکان دوو مەجلیس بەڕێوەی بردوون، مەجلیسێکیان بۆ خەڵکی بە تەمەن، وە مەجلیسێك بۆ کەسانی جەنگاوەر}.

٦- هەروەها هەر (مانغلابوس) لە هەمان کتێب لە لاپەڕە: (٤٣ - ٤٧)دا دەڵێ: {لە هیندیش بەر لە شەش سەدە پێش زایین، (١٢) کۆمار (جمهوریة) هەبوون، کە سەرۆکی یەکێکیان بابی بوزا بووە، کە هەر کام لە سەرۆکەکان پێیان گوتراوە (راجا) وە بە هەڵبژاردن دانراون}.

٧- هەروەها لە مەککەش پێش ئیسلام، هۆزی قوڕەیش (دار الندوة)یان هەبووە، وەك (إبن هشام) لە (السیرة النبویة)دا هێناویەتی.

**ئنجا ئایا خوشك و برایانی بەڕێز!**

**هۆکاری ئەمە چییە؟**

**هەر بە کورتیی دەڵێم:** سروشتی ساغی مرۆڤ، هەمیشە عەودالّی شتی باش و سوود بەخشە، ئنجا حالّەتی ئاسایی و خوارِسکی مرۆڤ ئاوایە، کە هیچ کەس پێی خۆش نیە بچەوسێنرێتەوە، وە هیچ کەس پێی خۆش نیە حیسابی بۆ نەکرێ، ئنجا ئەم نێوەڕۆکە (من نالێم: وشەی دیموکراسی، بەڵکو دەڵێم: ئەم نێوەڕۆکە)، کە خەڵك هەموویان بەشداربن لە دەستەلاّت و حوکمرانیی دا، شتێکی لە مێژینەیە لە ژیانی بەشەردا، وە لە نێو زۆربەی کۆمەڵگاکان دا هەبووە و شتێك نیە لە ئەورووپا هەڵقولاّبێ، وە پێش ئەوەی لە یۆنان ببێ، لە دوو شارەکەی ئەسپارتەو ئەسینا، پێشتر لە مێژووی بەشەردا هەبووە، چ لە ئەورووپاو، چ لە ئاسیاو، چ لە ئەفریقیاو، چ لە هەموو ئەو شوێنانەدا، کە بەشەریان تێدا ژیاون.

**کۆتایی ئەم کورتە سەرگوزشتەیەی دیموکڕاسیش، بەم سێ سەرنجە دێنم:**

**یەکەم: دیموکڕاسی لە یۆنان:**

١- لە یۆنان دیموکڕاسی ڕاستەوخۆ هەبووەو نوێنەرایەتیی نەبووە، خەڵك ڕاستەوخۆ لە ساحەیەکدا کۆبووەتەوە، ڕای خۆیان داوە.

٢- تەنیا پیاوانیش بۆیان هەبووە.

٣- تەنیا پیاوە ئازادەکانیش.

٤- وە تەنیا یۆنانییەکانیش بۆیان هەبووە.

**دووەم: دیموکڕاسی ڕۆژئاوا:**

دوای ئەوەی خەڵك لە ڕۆژئاوا لە تاو کڵێسا ڕای کرد، گەڕا بۆ سیستمێکی حوکمڕانیی وا، کە خەڵك بتوانن بە تەبایی بژین، ئیدی کە مێژووی خۆیان هەڵکۆڵی، دیموکڕاسییان دەرهێنایەوە، بە شێوە یۆنانییەکەی، بەڵام هەر لە سەرەتاوە بە شێوەی نوێنەرایەتیی (نیابی) بوو، نەك ڕاستەوخۆ (مباشر) ئنجا ئەویش دیسان لەسەرەتاوە بەم شێوەیەی ئێستا نەبوو، بەڵکو تەنیا دەوڵەمەندەکان بۆیان هەبوو دەنگ بدەن، دوایی ئەو مەرجەیان لابرد، بەڵام تەنیا پیاوان بۆیان هەبوو، دوایی وردە وردە ئافرەتانیشیان بەشدار کرد، ئیدی زۆر قۆناغی بڕین، هەتا بەم شێوەی ئێستای گەیشت.

**سـێیەم:**

ئێستاش بەردەوام دیموکڕاسی ڕەخنەی لێ دەگیرێ و، چاك دەکرێ و، دەستکاریی دەکرێ، وە دیموکڕاسی هەر وڵاتێك جیایە لەهی ئەوی دیکەیان و، هەر کامێکیان مۆرکی تایبەتی خۆی هەیە.

## تەوەری سێیەم:
## بەراوردێك لە نێوان دیموكڕاسیی و سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا

**دەتوانین بۆ بەرارد كردنی دیموكڕاسیی و سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلام دا بڵێین: سیستمی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا، ئەم حەوت بنەما و نیشانەیەی هەن[1]:**

١- خەڵك و جەماوەر بە گشتی سەرچاوەی دەستەڵاتە.

٢- ڕاوێژ (شوری) بناغەی حوكمڕانییە.

٣- حكوومەت لە ئیسلام دا، مەدەنییە، نەك ئایینی، وە حوكمڕانان وەكیلی خەڵكن، نەك خوا.

٤- كارو چالاكی سیاسیی، نەك هەر ماف، بگرە ئەركی هەر هاووڵاتییەكە، بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە، بەبێ هەڵاواردن.

٥- دەوڵەتی ئیسلامیی دەستی كراوەیە، بۆ وەرگرتنی هەر بیرۆكە و ئامراز و هۆكارێك، كە هێنانەدی بەرژەوەندیی (تحقيق مصلحة)یەكی لەسەری دەكەوێ.

٦- حوكمڕانان لە ئیسلام دا، لە بنەڕەت دا پیرۆز (مقدّس) نین، تاكو پیرۆزییان لێ دابڕنرێ.

---

(١) لە بەرگی دووەمی مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی)دا، بەناوونیشانی: (بنەماكانی سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیی) دە (١٠) بنەمای گەورە و گرنگمان هێناون و، بە درێژیی لە بارەیانەوە دواوین.

٧- ڕەخنه لێ گرتن و بەرەنگار بوونەوەی حوكمڕانانی ستەمكار، گەورەترین جۆری جیهادە.

**ئێستاش بە كورتیی سەرو تیشكیان دەخەینە سەر:**

**١- خەڵك و جەماوەر بە گشتی سەرچاوەی دەستەڵاتە:**

ئەمە یەكێكە لە بنەما گەورە و گرنگەكانی حوكمڕانیی لە ئیسلامدا، ئنجا وەك پێشتریش باسمان كرد، دەتوانین زۆر بەڵگان لەسەر ئەوە بێنینەوە:

**یەك:** دواندنەكان (خطابات) ی قورئان بۆ كۆمەڵگای ئیسلامیی، سەرجەمیان بە: (یَا أَیّها النَّاس) و (یَا أَیّها الَّذِینَ آمَنُوا) دەست پێدەكەن.

**دوو:** خوای زانا و شارەزا، فەرمانی بە كۆی خەڵك و كۆمەڵگای مسوڵمان كردوە، كە سپاردەكانی بەرپرسیارێتیی و حوكمڕانیی، بە كەسانی شایستە بسپێرن:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا ..﴿٥٨﴾ ﴾ النساء.

كەواتە: لە بنەڕەت دا بەرپرسیارێتیی و حوكمڕانیی، هی خەڵك و كۆمەڵگایە.

**سێ: یەكەمین قەوارەی سیاسی لە ئیسلامدا، كە لە سەر دەستی پێغەمبەری خاتەم (صلى الله علیه وسلم) بنیات نرا، پاش پەیمانی یەكەم و دووەمی عەقەبە (بیعتي العقبة الأولى والثانیة) بوو:** وەك لە (السیرة النبویة لابن هشام)دا هاتوە.

**٢- ڕاوێژ (شورى) بناغەی حوكمڕانییە:**

وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ ...وَأَمۡرُهُمۡ شُورَىٰ بَيۡنَهُمۡ ...﴿٣٨﴾ ﴾ الشورى.

واتە: وە كاروباری بڕواداران بە ڕاوێژە لە بەینیاندا.

وشەی (أمر)یش هەرچەندە چەمكەكەی گشتی و فراوانە و، هەموو جۆرە كاروبارێك دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر كاروباری: جەنگ و ئاشتیی و سیاسی و كۆمەڵایەتیی دەگرێتەوە...

**٣- حکوومەت لە ئیسلام دا مەدەنییە، نەك ئایینیی، وە حوکمڕانان وەکیلی خەڵکن، نەك خوا:**

جیاوازیی بنەڕەتیی نێوان حکومەتی مەدەنیی و حکومەتی ئایینیش، ئەوەیە کە یەکەمیان لەسەر بناغەی ڕەوایەتیی (شرعیة) وەرگرتن لە خەڵك، بنیات دەنرێ، بەڵام دووەمیان خەیاڵی وایە، ڕەوایەتیی لە خواوە وەرگرتوە! شایانی باسیشە کە کاتی خۆی بەمجۆرە حوکمڕانییە گوتراوە (ثیۆکراسیی theocracy) یانی: حوکمی خوایی، یان حوکمی ئایینیی، وە ئەو جۆرە حوکمڕانییە، چەندان سەدە بوو لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا باو بوو، تاکو بەرپابوونی شۆڕشی فەڕەنسا، لەساڵی: ١٧٨٩ز دا .

دەشتوانین گەلێك بەڵگان لەسەر ئەوە بێنینەوە، کە حوکمڕانیی لە ئیسلام دا، مەدەنییە، نەك ئایینیی:

**یەك: خەڵك و جەماوەر بە گشتی خاوەن و سەرچاوەی دەسەڵاتە:**

أ- وەك لە بنەمای یەکەمدا گوتمان، خەڵك و جەماوەر بە گشتی سەرچاوە و خاوەنی دەسەڵاتی سیاسی یە، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) تاکو لە پەیمانی یەکەمی عەقەبە و پەیمانی دووەمی عەقەبەدا، ڕەوایەتیی لە خەڵکی شاری (یثرب) وەرنەگرت، کۆچی نەکرد و جاڕی قەوارە سیاسییەکەی خۆی نەدا، هەرچەندە بە دڵنیایی لە یەکەمین ڕۆژەوە ڕەوایەتیی ئاسمانیی و خوایی هەبوو، بەڵام هەتا ڕەوایەتیی زەمینیی و خەڵکیی دەستەبەر نەکرد، ئیعلانی قەوارە سیاسییەکەی خۆی نەکرد!

ب- ئەبو بەکری صیددیق (خوا لێی ڕازی بێ)، یەکەمین خەلیفەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) کاتێك مسوڵمانان هەڵیانبژارد و بەیعەتیان پێدا، لەیەکەمین وتاری دا گوتی: (يَا أَيُّهَا النَّاس! إِنِّي قَدْ وُلِّيْتُ عَلَيْكُمْ وَلَسْتُ بِخَيْرِكُمْ، فَإِنْ أَحْسَنْتُ، فَأَعِينُونِي، وإِنْ أَسَأْتُ فَقَوِّمُونِي)[1]. واتە: ئەی خەڵکینە! من بەسەرتانەوە

---

(١) الكامل في التأريخ، لابن الأثير ج ص ٢٢٥.

كراومە سەرپەرشتیار، بەڵام باشترینتان نیم، ئنجا ئەگەر چاكەم كرد، هاوكاریيم بكەن، وە ئەگەر خراپەم كرد، ڕاستم بكەنەوە.

**دوو: حوكمڕانان پابەندن بە دەستوور و یاساوە:**

وەك خوای بەرزی مەزن فەرمووبەتی:

﴿ ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨﴾ ﴾ الجاثية.

**سێ: حوكمڕانان لە چین و بنەماڵە و نەتەوەیەكی دیارییكراو نین:**

هەر كام لە چوار خەلیفە ڕاشیدەكان: ئەبو بەكر، عومەر، عوسمان، عەلی (خوا لێیان ڕازی بێ)، لە تیرەو هۆزێكی جیاواز، لە وانی دیكە بوو:

١- ئەبو بەكر (بنو تمیم).
٢- عومەر (بنو عدي).
٣- عوسمان (بنو أمیة).
٤- عەلی (بنو هاشم).

هەڵبەتە تیرەو هۆزەكانی ئەو ساش، لەجێی حیزبە سیاسییەكانی ئەم ڕۆژگارە بوون، كەواتە، لە نێو ئەو چوار لایەنە سیاسییەدا، دەستاو دەستی ئاشتییانەی دەسەڵات بووە!

ئنجا ئەوەی (معاویة بن أبي سفیان)یش كردی، بە دەقی فەرموودەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، لادان بوو لە ڕێباز و ڕێ وشوێنی وی، وەك فەرموویەتی: {أَوَّلُ مَنْ يَغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ} (أَخْرَجَه ابْنُ أَبي عَاصم فِي (الأوائل) (ج٧، ص٢)، قَالَ الألباني: وَهَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ، رِجَالُهُ ثِقَات رِجَالُ الشَّيْخَيْنِ غَيْر المُهَاجِر وَهُوَ ابْنُ مُخَلَّد)، واتە: یەكەمین كەس كە ڕێبازەكەم دەگۆڕێ، پیاوێكە لەهۆزی بەی ئومەییە (الألباني)یش گوتوویەتی: (وَلَعَلَّ المُرَاد بالحَدِيث تَغْيير نِظَام اختيَار الخَلِيفَة وَجعله وراثة وهو الظاهر)، واتە: ڕەنگە مەبەست لە فەرموودەكە، گۆڕینی سیستمی هەڵبژاردنی خەلیفەو گۆڕانی بە میراتیی بێ، هەرواش دیارە.

**٤- کارو چالاکی سیاسی نەك هەر ماف، بگرە ئەرکی هەر هاووڵاتییەکە، بە مسوڵمان و نامسوڵمانەوە، بە بێ هەڵاواردن:**

لەو بارەوەش دەگونجێ زۆر بەڵگان بێنینەوە، بۆ نموونە:

١- ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ...﴿٧١﴾ ﴾ التوبة.

واتە: بڕوادارانی پیاو و بڕوادارانی ئافرەت، هەندێکیان دۆست و پشتیوانی یەکدین فەرمان بەپەسەند دەکەن و، ڕێگری لە ناپەسەند دەکەن.

دیارە فەرمان کردن بە هەرچی پەسندە و، ڕێگریی کردن لە هەرچی ناپەسندە، چەمکەکەی یەکجار فراوان و گشتییە و، سەرجەم بوار و لایەنەکانی ژیان و گوزەران و دینداریی و دنیاداریی دەگرێتەوە: فیکریی، عەقیدەیی، سیاسی، ئابووریی، کۆمەلایەتیی...

ئەوە بە نسبەت مسوڵمانانەوە بە گشتی.

٢- بە نسبەت نامسوڵمانانیشەوە، با سەرنجی دوو دەق (نص)بدەین، لە دوو پەیمان و ڕێککەوتننامەی نێوان پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و مسوڵمانان لە لایەك و، جوولەکە و نەصرانییەکان، لەلایەکی دیکەوە:

أ- لەو (وثيقة)یەدا کە پێغەمبەری خوا، لە نێوان پێکهاتەکانی شاری مەدینەدا نووسی و وەك (دستور)ی ئێستا بوو، لە بڕگەی (٢٥)دا هاتوە:

(وَأَنَّ يَهود بَني عَوْف أُمَّة مَعَ المؤمنين، لليهود دينهم وللمؤمنين دينهم...).[١]

واتە: وە جوولەکەکانی بەنی عەوف کۆمەڵێکن، قەوارەیەکن لەگەڵ بڕواداراندا، جوولەکە ئایینی خۆیان هەیە و، بڕوادارانیش ئایینی خۆیان هەیە.

ب- وە لەو (وثيقة)یەدا، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بۆ نەصرانییەکانی نەجرانی نووسیوە، هاتوە:

---

(١) بڕوانە: مجموعة الوثائق السياسية للعهد النبوي والخلافة الراشدة، محمد حميد الله ص ٥٧-٦٢، (كتابه صلى الله عليه وسلم بين المهاجرين والأنصار، واليهود، وهو دستور الدولة البلدية بالمدنية).

(.. لأَني أَعْطَيتهُم عَهْد الله أَنَّ لَهُمْ مَا لِلْمُسْلِمِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُسْلِمِينَ، وَعَلَى الْمُسْلِمِينَ مَا عَلَيْهِم.. بالعَهْدِ الَّذِي اسْتَوجبُوا حَقَّ الذِّمَام وَالذَبَّ عَنِ الحُرْمَة، واستوجبوا أَنْ يُذبَّ عَنْهُمْ كُلُّ مَكْرُوه، حَتَّى يَكُونوا للمُسْلِمِين شُرَكَاء، فِيمَا لَهُمْ وَفِيمَا عَلَيْهِم ..)[1]

واته‌: .. چونكه‌ من به‌ڵێنی خوام پێداون، كه‌ هه‌مان ماف، كه‌ مسوڵمانان هه‌یانه‌، ئه‌وانیش هه‌یانبێ، وه‌ هه‌مان ئه‌رك كه‌ له‌سه‌ر مسوڵمانانه‌، له‌سه‌ریان بێ، وه‌ مسوڵمانانیش هه‌مان ئه‌ركی كه‌ له‌ سه‌ر وانه‌، له‌سه‌ریان بێ، به‌ پێی ئه‌و په‌یمانه‌ی كه‌ به‌ هۆیه‌وه‌، له‌سه‌ر مسوڵمانان بۆیان پێویست بووه‌ كه‌رامه‌ت و حورمه‌تیان بپارێزرێ، وه‌ بۆیان پێویست بووه‌، كه‌ هه‌ر خراپه‌یه‌كیان لێ دووربخرێته‌وه‌، تاكو سه‌ره‌نجام: له‌ سه‌رجه‌م ماف و ئه‌ركه‌كاندا، ببنه‌ هاوبه‌شی مسوڵمانان.

بێگومان ئه‌و ڕسته‌یه‌ش: (حَتَّى يَكُونوا للمُسْلِمِين شُرَكَاء، فِيمَا لَهُمْ وَفِيمَا عَلَيْهِم) سه‌رجه‌م ئه‌و ئه‌رك و مافانه‌ ده‌گرێته‌وه‌، كه‌ به‌بێ ده‌سته‌به‌ر كرانیان، هاووڵاتێتیی (مواطنة)، یان به‌ ته‌عبیری پێغه‌مبه‌ری خاته‌م (صلى الله عليه وسلم): هاوبه‌شێتیی (شراكة) هاوبه‌شان (شركاء)، نایه‌ته‌دی، به‌ تایبه‌ت مافه‌ سیاسییه‌كان.

ئنجا پێویسته‌ لێره‌دا ئه‌و ڕاستییه‌ش بزانرێ، كه‌ له‌ ڕۆژگاری پێغه‌مبه‌ری خوادا، ئه‌و جووله‌كه‌و نه‌صرانییانه‌ی له‌ ژێر سایه‌ی ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی و، قه‌ڵه‌مڕه‌وی دا ده‌ژیان، بۆیه‌ نه‌هاتوونه‌ته‌ نێو پێكهاته‌ی قه‌واره‌ سیاسییه‌كه‌وه‌، چونكه‌ خۆیان قه‌واره‌ی سیاسییان بووه‌و، به‌ زاراوی ئێستا: له‌ حاڵه‌تی فیدراڵیی و كۆنفیدراڵییدا بوون، له‌گه‌ڵ ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی دا.

**٥- ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی ده‌ستی كراوه‌یه‌، بۆ وه‌رگرتنی هه‌ر بیرۆكه‌ و ئامراز و هۆكارێك، كه‌ هێنانه‌دی به‌رژه‌وه‌ندیی (تحقيق مصلحة) یه‌كی له‌سه‌ری ده‌كه‌وێ:**

ده‌گونجێ له‌و باره‌وه‌ زۆر به‌ڵگه‌ بهێنرێنه‌وه‌، كه‌ ئیسلام نه‌ك هه‌ر ده‌ستی مسوڵمانان به‌ گشتی و، قه‌واره‌ سیاسییه‌كه‌یانی به‌ تایبه‌ت، ئاوه‌ڵاكردوه‌ بۆ

---

(١) سه‌رچاوه‌ی پێشو، ص ١٨٨، ١٨٩ (نسختان: المكتوب النبي صلى الله عليه وسلم إلى نجران).

وەرگرتنی بیرۆكە و ئەزموون و ئامراز و هۆكارە سوود بەخشەكان، بگرە لەسەریشی پێویست كردوون، بۆ نموونە:

أ- ﴿ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ ﴾ الزمر.

كە پێشتریش هێنامان و ماناشمان كرد.

ب- {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمْرِ دُنْيَاكُمْ} (أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: ٢٣٦٣، وَغَيْرُهُ).

واتە: ئێوە بە كاروباری دنیایی خۆتان زاناترن.

كە بێگومان مەبەست پێی ئەو كارو بارانەیە، كە ئەزموون و شارەزایی و پسپۆریی یان دەوێ، وەك لە هۆی هاتن (سبب الورود)ە كەیەوە دیارە، كە بریتیە لە بەسەرهاتی متوربە كردن (تلقیح)ی دارخورمایەكان، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێی وابوو پێویست ناكات و، ئەوانیش "متوربەكارەكان" وایانزانی وەك ئایین و وەحی خوا ئەوەی خستۆتە ڕوو، وە وازیان لێ هێناو دارخورمایەكان بەریان نەگرت، یان بەرێكی خراپیان گرت، ئنجا دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا بەمەسەلەكەی زانی، بۆی ڕوونكردنەوە، كە تەنیا وەك بۆچوونی تایبەتیی خۆی، ئەوەی فەرمووەو، پێشی فەرموون، با بۆ كاروباری دنیایی خۆیان، كە حەوجێی بەشارەزایی و ئەزموون پسپۆریی یە، پشت بە خۆیان ببەستن!

### ٦- حوكمڕانان لە ئیسلامدا لە بنەڕەت دا پیرۆز (مقدس) نین، تاكو پیرۆزییان لێ دابڕنرێ:

لە ڕوانگەی ئیسلامەوە هەموو مرۆڤەكان "بەبێ جیاوازیی" بەڕێزن: ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾ ﴾ الإسراء، بەڵام هیچ كەس: حوكمڕان و غەیری حوكمڕان، بەپاك و بێ خەوش و پیرۆز (مقدس) دانانرێ.

وە خوای كاربەجێ لە قورئانیدا، ئاماژەی بۆ گەلێك خاڵی بێ هێز (نقاط ضعف) و سیفەتی خراپی مرۆڤان كردوە، كە مەگەر بە هۆی ئیمان بە خوا و، دەستگرتن بە ئایین و پەیانی خواوە، ئەگەرنا، لێیان دەربازیان نابن:

١- ﴿وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ٧٢﴾ الأحزاب.

٢- ﴿خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ٣٧﴾ الأنبياء.

٣- ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ٢٨﴾ النساء.

٤- ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ٥٤﴾ الكهف.

٥- ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ٦٦﴾ الحج.

٦ و ٧- ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ٧ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ٨﴾ العاديات.

پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) لە بارەی گوناهکاریی و هەڵەکاریی سەرجەم مرۆڤانەوە فەرموویەتی: {"كُلُّ بني آدَمَ خَطَّاءٌ، خَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ"}[1]. واتە: تێکڕای وەچەی ئادەم، هەڵەکارن و، باشترین هەڵەکارانیش زۆر بۆ لای خوا گەڕاوان.

**٧- ڕەخنە لێگرتن و بەرەنگاربوونەوەی حوکمڕانانی ستەمکار، گەورەترین جیهادە:**

سەرەتا دەڵێین:

خوای دادگەر نەفرینی لە ستەمکاران کردووە:

أ- ﴿أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ٤٤﴾ الأعراف.

ب- ﴿أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٨﴾ هود.

ئنجا بێگومان حوکمڕانی ستەمکار، بەر لە هەر ستەمکارێك، نەفرین (لعنة)ی خوای دادگەر دەیگرێتەوە و کەسێکیش خوا نەفرینی لێ بکات، پێویستە ڕەخنەی لێ بگیرێ و، بگرە بەرەنگارییشی بکرێ و، دەستیشی بگیرێ!

---

(١) رَوَاهُ أَحْمَد برقم: (١٣٠٧٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٢٥١)، وَالدَّارِمِيُّ برقم: (٢٧٢٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٦١٧) وَقَالَ: صحيح الإسناد، وَحَسَّنَهُ الألباني في "المشكاة" برقم: (٢٣٤١) عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه.

هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:

أ- {إِنَّ مِنْ أَعْظَمِ الْجِهَادِ كَلِمَةَ عَدْلٍ عِنْدَ سُلْطَانٍ جَائِرٍ} (أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٧٤)، وَصَحَّحَهُ كُلٌ مِن الأَلبَاني وَشُعَيْب الأرنؤوط).

واتە: بێگومان قسەیەكی دادگەرانە كردن لەلای حوكمڕانێكی ستەمكار، لە مەزنترین جیهادە .

ب- {إِذَا رَأَيْتَ أُمَّتِي تَهَابُ الظَّالِمَ، أَنْ تَقُولَ لَهُ: أَنْتَ ظَالِمٌ، فَقَدْ تُوُدِّعَ مِنْهُمْ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٧٨٤)، صحَّحَهُ أحمد شاكر، وَأَخْرَجَهُ البَزَّار برقم: (٢٣٧٥)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٠٣٦)، وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد وَوَافقه الذهبي، وَالبَيْهَقِي فِي "شعب الإيمان" برقم: (٧٥٤٦)).

واتە: هەر كات ئۆممەتی منت بینی لە ستەمكار دەترسا، كە پێی بڵێ: تۆ ستەمكاری! ئەوە ماڵئاواییان لێكراوە و حیسابیان ڕۆیشتوە.

## پوختەی ڕای بەندە لە بارەی دیموكڕاسی یەوە:

**لە پێنج خاڵاندا پوختەی ڕاو بۆچوونی خۆم لەبارەی دیموكڕاسییەوە، دەخەمەڕوو:**

**یەك:** هەرچەندە دیموكڕاسی وەك هەر بیرۆكەیەكی دیكەی زادەی بیرو هۆشی مرۆڤ، بێ كەم وكوڕیی نیە، بەڵام "وەك لە مێژ ساڵە گوتوومە و ئێستاش دەڵێم:" دیموكڕاسیی لە نێو سیستم و شێوازەكانی دیكەی باوی حوكمڕانییدا، باشترین شێوازە، كە مرۆڤ بۆ بەڕێوەبردنی كاروباری كۆمەڵگا و دەوڵەت، بەرهەمی هێناوە، وە دیموكڕاسی (چاكی نێو خراپانە)، وە (لە چاو شلان پەیتە)! وە بە ڕای من: وێڕای هەبوونی وردە تێبینی لەسەر هەندێك لایەنی دیموكڕاسی، بەڵام بە گشتی وەك میكانیزمی حوكمڕانیی، هەتا ئێستا سەركەوتووترین شێوازی حوكمڕانییە و، لە هەموویان خراپەی كەمترە.

**دوو:** هیچ كام لە بنەمایەكانی:

١- خەڵك سەرچاوەی دەستەڵات بوون.

٢- هەڵبژاردن.

٣- لە یەك جیاكردنەوەی سێ دەستەڵاتەكان.

٤- سەروەریی یاسا.
٥- دابین كردنی ماف و ئازادییەكان بۆ هاووڵاتییان، بێ جیاوازیی.
٦- دەستا و دەست پێكردنی دەستەڵات، بە شێوەیەكی ئاشتییانە.
٧- حوكم كردنی زۆرینە و، پاراستنی مافی كەمینە.

نەك هەر ناكۆك نین لەگەڵ ئیسلام دا، بگرە پێوستیشن، چ بە حوكمی دەقە ڕاستەوخۆیەكانی شەریعەت، وە چ بە حوكمی چەندان بنچینەی شەرعیی، بۆ وێنە:

١- (أَيْنَمَا وجد العَدْلُ فَثَمَّ شَرْعُ الله، وَأَيْنَمَا وَجدت المَصْلَحَة فَثَمَّ شَرْعُ الله).

واتە: دادگەریی لە كوێ بێ، شەریعەتی خواش لەوێیە، وە بەرژەوەندیی لە كوێ بێ، شەریعەتی خواش لەوێیە.

٢- (للوَسَائِلِ حُكْم المَقَاصِد).

واتە: ئامراز و هۆكارەكان، هەمان حوكمی ئامانجەكانیان هەیە.

٣- (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ).

واتە: هەر شتێك فەرزێك بەبێ وی نەكرێ، ئەویش فەڕزە.

٤- (الأَمْرُ بالشيءِ، أَمْرٌ به وَبِمَا لا يتم إلاَّ بهِ، وَالنَّهْيُ عَنْ الشَّيْءِ، نَهِيٌ عَنْهُ وَعَمَّا يُؤَدِّي إِلَيْهِ).

واتە: فەرمان كردن بە شتێك، فەرمانكردنە بە خودی ئەو شتە و، بەوەش، كە بەبێی ناكرێ، وە ڕێگریی لە شتێك، ڕێگرییە لە خۆی و، لەوەش كە لێیەوە پەیدا دەبێ.

٥- (الأَصْلُ فِي المُعَامَلاَتِ العَفو، إِلاَّ ما دَلَّ الشَّرْعُ عَلَى مَنْعه).

واتە: بناغە لە هەڵس وكەوتەكاندا، ڕێ پێدرانە، جگە لەوەی شەریعەت ڕێ لێگرتنی دەگەیەنێ.

سێ: گرفت و ئیشكالی بنەڕەتیی، كە لە دیموكڕاسی دا هەیە، بریتیە لەوە، كە

بەرِەهایی مافی یاسادانان (تشریع) و بڕیاردان دەداتە دەست خەڵك، بەڵام لە ئیسلام دا سەروەریی ڕەها و باڵای یاسادانان (حاكمیة التشریع المطلقة والعُلْیَا) تەنیا هی خوایە، وە تەنانەت هی پێغەمبەریش نیە وەك خوا لەسەر زمانی (یوسف) علیه السلام فەرموویەتی:

أ- ﴿ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ یوسف.

ب- ﴿ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ ﴿٢١﴾ ﴾ الشوری.

کە بێگومان مەبەست لە وشەی (الحكم) لە ئایەتی یەکەم داو، وشەی (شرعوا) لە ئایەتی دووەم دا: یاسادانان و دیاریی کردنی چاکە و خراپە و، حەڵاڵ و حەرامە، کە ئەوەش تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە.

چوار: بەڵام کە باسی بە خواوە تایبەت بوونی: سەروەریی باڵا و ڕەهای یاسادانان، دەکەین، نابێ لە دوو ڕاستیی دیکەی گرنگیش بێ ئاگا بین:

١- سەروەریی باڵای سیاسیی، کە پێی دەگوترێ: دەستەڵات (سلطة) هی خەڵك و کۆمەڵگایەو، ئەوە خۆیانن کە بەرپرسانی خۆیان لە هەموو بوارەکاندا هەڵدەبژێرن و لێیان دەپرسنەوە و، ئەگەر بە پێویستیان زانی: لاشیان دەدەن.

٢- هەروەها خەڵك و کۆمەڵگای مسوڵمان، سەروەریی بەشیی یاسادانان (السیادة الجزئیة التشریعیة)یان هەیە و، لەبەر ڕۆشنایی شەریعەتدا، کۆشش (إجتهاد) دەکەن و یاسایان دادەنێن.

پێنج: جیاوازیی سەرەکیی نێوان ڕاوێژ (شوری)ی ئیسلام و دیموکڕاسی، ئەوەیە، کە دیموکڕاسیی، هیچ چوارچێوە و پەرژینێکی نیە، لەلادان بیپارێزێ، بەڵام ڕاوێژ (شوری)ی ئیسلامیی، بە شەریعەت دەور دراوە و، لە هەڵە و لادان

پارێزراوە، خوای زاناو شارەزاش فەرموویەتی:

﴿ وَلَوِ اتَّبَعَ الْحَقُّ أَهْوَاءَهُمْ لَفَسَدَتِ السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ﴾ (٧١) المؤمنون.

واتە: وە ئەگەر هەق شوێنی ئارەزووەكانیان كەوتبایە، ئاسمانەكان و زەوی و هەر كەس، كە تێیان دایە، تێك دەچوون.

بەڵێ، ئەو سنوورانەی چاكە و خراپە و حەڵاڵ و حەرام، كە شەریعەت دیاریی كردوون، هیچ كەس و هیچ پەرلەمان و ئەنجوومەنێك بۆی نیە، بیانبەزێنێ و، یاسا و بریارێك دەربكات، كە لەگەڵ شەریعەت و یاسا ئاشكرایەكانیدا، تێك بگیرێ.

بەڵام، دەبێ دان بەو ڕاستییە تاڵەش دا بنێین، كە بەداخەوە، هەر لە زووەوە لەلایەن موعاویەی كوڕی ئەبو سوفیان و ئومەوویەكانەوە، لە بواری حوكمڕانییدا، بە تایبەت بۆ دانانی بەرپرسان "یەكی ڕاوێژ (شوری) خرا و، نەهێڵرا گەشە بكات و لە چەند دامەزراوە و میكانیزم، (مؤسسات وآليات)ێكدا، بەرجەستە ببێ و، زیاتر وەك بەها (قیمة)یەكی ئاكاریی و مەعنەویی و تیۆریی مایەوە.

بۆیە ئێستا، ئەگەر بمانەوێ ڕاوێژ كارا و پراكتیزە بكەین، پێویستە سوود لە میكانیزمەكانی دیموكڕاسیی وەربگرین، كە بە دڵنیاییی، ئا ئەوە "بەهرەمەندبوون لە ئەزموون و ئامرازەكانی خەڵكی دیكە" ڕێباز و شێوازی حوكمڕانیی و ئیدارەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەكانیش بووە و كاتی خۆی ئەوان لە ئەزموون و ئامرازەكانی فارس و ڕۆم، بەهرەی باشیان وەرگرتوە، وێڕای دەستگرتن و پابەندیی بە یاسا و بەهاكانی شەریعەتەوە.

**براو خوشکانی بەڕێز!**

هەر ئایین و بەرنامەیەك، دەبێ ئامانجی ئەوە بێ، کە لە واقیعدا بەرجەستە ببێ و، مایەی بەرەو پێش بردنی ژیانی خەڵك و بەختەوەر کردنی بێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلْحَقِّ ...﴾ ﴿٤١﴾ الزمر.

واتە: کتێبمان بۆ سەر تۆ ناردۆتە خوار، بۆ خەڵك، بە هەق.

قورئان بۆ خەڵك هاتوە، بۆ بەختەوەر کردنی خەڵك، بۆ ئەوە کە خەڵك بەشێوەیەك بژین، کە بەختەوەری دنیاو سەرفرازی دواڕۆژ بن، ئنجا ئێمەش لەم هەرێمی کوردستانەدا با بێین ئەو سیستمی حوکمڕانییە، کە باسی سیکۆلاریزم دەکات، وە باسی دیموکراسی دەکات، با لە مەحەکیان بدەین، ئەدی ناگوترێ: تاقی کردنەوە باشترین بەڵگەیە؟ با بزانین چۆن دەردەچن؟ سەرەتا با تەماشای سیکۆلاریزم بکەین:

# سـیکۆلاریـزم

سەرەتا وەك پێشتر گوتم، دەڵێم: لە وڵاتێکی ئیسلامیی دا، کە خەڵك لە ئیسلام تێگەیشتبێ، سیکۆلاریزم پاساوی بوونی نیە، چونکە هەموو ئەو شتانەی، کە تۆ بۆیان لە سیکۆلاریزمدا دەگەڕێی، هەموویان لە ئیسلامەکەی خۆتدا هەن، بەشێوەیەکی باشتر، وە کۆمەڵێك کەم و کوڕیی بێڕەزاو گورچك بڕ لە سیکۆلاریزمدا هەن، وەك حیساب نەکردن بۆ خواو، بۆ ڕۆژی دوایی، کە هەڵبەتە ئیسلام ئەوانەشی تێدانیە، واتە: ئیسلام چاکەکانی سیکۆلاریزمی هەموو تێدان، وە لە خراپەکانیشی دوورە، وە بەڵگەشم بۆ ئەمە " کە سیکۆلاریزم لە نێو مسوڵمانانی لە ئیسلام تێگەیشتوودا، پاساوی بوونی نابێ" ئەوەیە: تەماشای پانایی و درێژایی جیهانی ئیسلامیی بکە! بزانە لە کوێدا کۆمەڵگایەکی مسوڵمان، ئەو سیکۆلاریزمەی قبووڵ کردوە، مادام لە ئیسلام تێگەیشتبێ؟ قبووڵ نەکراوە، وە دەڵێم بە داخەوە مەسرەفێکی زۆر لە ماڵ و سامانی مسوڵمانان لە سیکۆلاریزم کراوە، وە پشتیوانی دەرەکییشی لێکراوە، کەچی هەر ڕەوایەتیی (شرعیة)ی پەیدا نەکردوە، ئێستاش لەگەڵ دابێ، سیکۆلاریستەکانمان بەشەرمەوەو لە ژێر لێوەوە، باسی سیکۆلاریزمەکەی خۆیان دەکەن! بۆچی؟ چونکە جێ پێی نیە، چونکە پاساوی بوونی نیە، ئاخر هەرچی تۆ بۆی لە سیکۆلاریزمدا دەگەڕێی، لە ئیسلامی خۆتدا هەیە، بە باشتر.

**پاشان دەڵێم:** دەرهاویشتە ئەرێنییەکانی سیکۆلاریزم لە ڕۆژئاوا، لە نێو ئێمەدا نین، من بێ ئینصاف نیم، دەڵێم ڕۆژئاواییەکان، کە پەنایان بردە بەر

سیکۆلاریزم، لە واقیعێکی زۆر دژوار خۆیان دەرباز کرد، وە بۆ ژیانی دنیای خۆیان، کۆمەڵێك بەهرەیان لە سیکۆلاریزم وەرگرتن:

١- مرۆڤ بوون و هاووڵاتیی بوون، کردنە پێوەر، ئەوان وایان کرد، بەڵام ئایا لە لای ئێمە وایە؟ نەخێر، بەڵکو لای ئێمە خێڵ و بنەماڵەو حیزب، پێوەرە، نەك مرۆڤ بوون و هاووڵاتیی بوون!

٢- چەسپاندنی یەکسانیی و دادگەریی، لە ڕۆژئاوا، تا ڕاددەیەکی زۆر ئەوە کراوە، بەڵام لێرە سیکۆلاریزم، قۆرخکاریی و گەندەڵیی و قڕیی و پڕیی، بۆ بەرهەم هێناوین!

٣- لە ڕۆژئاوا سیکۆلارەکان وڵاتی خۆیان ئاوەدان کردەوە، ژێر خانی ئابووریی خۆیان گەشە پێدا، بەڵام لێرە، قەرزدارو هەژارین و، لات و مەینەتبارین!

٤- لە ڕۆژئاوا بە هۆی سیکۆلاریزمەوە، "کە هەڵبەتە سیکۆلاریزم پەیوەندییشی بە لێکۆڵینەوەی زانستیی و ئازادیی عەقڵیشەوە هەبوو" زانست بەرەو پێشەوە چوو، فیکرو ئەدەب بەرەو پێشەوە چوو، وە هونەری بونیادنەریشیان بەرەو پێشەوە برد، بەڵام لە لای ئێمە ئاستی زانستیی بەرەو دواوە گەڕاوەتەوە، وە هونەرو ئەدەبیش، زیاتر بە باری ڕووخێنەرو وروژێنەری دا، بەکاری دێنن!

٥- لە ڕۆژئاوا بە کردەوە، کە دینیان لە ژین دابڕی و، دینیان لە دەوڵەت دابڕی، دەستیان وەرنەدایەو کاروباری ئایینی، بەڵام من پێم سەیرە، لێرەدا حیزبێکی سیکۆلاریست، وە حکوومەتێکی سیکۆلاریست، یەکێتی زانایانی بۆچییە؟ تەکیەو تەریقەتی بۆچییە؟ سەلەفیی و خەلەفیی بۆچییە؟ تۆ ئیشی خۆت بکە، خەریکی گەشە پێدانی ژیان بەو، بەرەو پێشەوەی بەرەو، ژێر خانی ئابووریی بۆ وڵاتەکەت دابمەزرێنە، ئیدی ئەو شتانەی دیکەت بۆچییە؟ بۆچی لە خۆتیان دەئاڵێنی؟ ئەگەر لەگەڵ بەرنامەکەی خۆتدا واقیعیی و ڕاست دەکەی؟! ئێوەش بۆچی وەك ڕۆژئاواییەکان ناکەن، کە هەرچەندە بە فەڕمیی ئایینیشیان لە دەوڵەت جیاکردۆتەوە، بەڵام هەوڵیان داوە لە بەها ڕووحیی و ئاکارییەکانی

ئایینەكەیان بەهرەمەندبن، كەچی سیكۆلاریستەكانی ئێمە، وێڕای لافی سیكۆلاربوون لێدان لە لای ڕۆژئاواییەكان، لافی مسوڵمانەتیی و دینداربوونیش لێدەدەن، بەڵام لەوەتی ڕاپەڕین كراوە "لە: ١٩٩١ زدا" واتە: چارەگە سەدەیەكە، هەتا ئەم چركە ساتە لەو چینە سیاسییە سیكۆلارە حوكمڕانەی خۆمان، بۆ تەنیا جارێكیش لە بەرپرسێكم نەبیستوە، باسی خوا (جَلَّ وعلا)، باسی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، باسی قورئان، باسی ڕۆژی دوایی بكات؟ تەنانەت بەقەدەر (باراك ئۆباما)ش، باسی ئایینەكەی خۆیان " كە دەڵێن: بڕوامان پێیەتی" ناكەن، باراك ئۆباما گوتی: (ئیسلام دینی ڕەحمەتە، ئیسلام دینی دادگەرییە، وە ئەوەی كە داعش و گرووپە پەرگیرەكان دەیكەن، ئیسلام لێی بەرییە)، كەچی عەلمانییەكانی لای ئێمە، پێیان عەیبە باسی دینەكەی خۆیان بكەن، ئنجا هەموومان دەزانین، كە دەوڵەتێك لە ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست هەیە، بەناوی ئیسڕائیل، كە بە ناوی یەكێك لە پێغەمبەرانەوە ناونراوە[١]، دەوڵەتێكی دینییەو، تاڕادەیەك دیموكراسیشەو زلهێزیشەو دەستەڵاتیشی هەیە[٢]، بەڵام وەك بڵێی سیكۆلارەكانمان بڕیاریان دابێ، كە دانوویان لەگەڵ ئەو ئیسلامەی خۆماندا هەر نەكوڵێ! بەڵێ، ئا ئەوەیە شێوەی سیكۆلاربوونی حیزب و دەستەڵاتە سیكۆلاریستەكانی هەرێمی كوردستان!

---

(١) چونكە (إسرائیل) نازناوی یەعقووب پێغەمبەرە علیه السلام، (إسرائیل)یش واتە: (عبدالله)،

(٢) كەچی لە سیكۆلارەكانی خۆمانم نەبیستوە، ڕەخنەی دەوڵەتی ئایینی بوون، لە قەوارەی جوولەكە بگرن!

## دیموكڕاسی

وه‌ك پێشتریش گوتمان: دیموكڕاسی به‌ مانای ده‌ست كراوه‌یی خه‌ڵك بۆ دانان و لێپرسینه‌وه‌ی به‌رپرسان و، كار پێ سپاردنیان، كه‌له‌پوورێكی له‌مێژینه‌ی به‌شه‌ره‌، وه‌ به‌رنامه‌كانی خوا، وه‌ پێغه‌مبه‌ران (علیهم الصلاة والسلام) به‌قه‌ناعه‌تی من داڕێژه‌ری ئه‌وه‌ بوون، كه‌ خه‌ڵك سه‌رچاوه‌ی ده‌سه‌ڵات بێ، چونكه‌ هیچ پێغه‌مبه‌رێك نه‌هاتوه‌، كه‌ فیرعه‌ونێك یه‌خه‌ی پێ نه‌گرتبێ، له‌ سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه‌، كاتێك پێغه‌مبه‌ران هاتوون: چینی خۆبه‌زلگران و چینی خۆشگوزه‌رانان، ئه‌وانه‌ی، كه‌ هه‌ر خه‌ریكی ئه‌وه‌بوون شه‌پ و گوپ له‌سه‌ر حیسابی خه‌ڵكی هه‌ژارو نه‌دار لێبده‌ن، ئه‌وانه‌ یه‌خه‌یان به‌ پێغه‌مبه‌ران گرتوه‌، بۆچی؟ زانیویانه‌ به‌ هۆی به‌رنامه‌ی پێغه‌مبه‌رانه‌وه‌، ئه‌و به‌زم و بازاڕه‌یان لێ تێك ده‌چێ، كه‌واته‌: پێغه‌مبه‌ران هاتوون، دادگه‌ریی بچه‌سپێنن، وه‌ گوتوویانه‌: خه‌ڵك به‌س ده‌بێ به‌نده‌ی خوابێ، تاكو هه‌ندێكیان به‌سه‌ر هه‌ندێكیانه‌وه‌ نه‌بنه‌ په‌رستراوو په‌روه‌ردگارو، خۆیان به‌سه‌ره‌وه‌ نه‌كه‌نه‌ فیرعه‌ن و قاڕوون.

وه‌ من پێم وایه‌ له‌ ئایه‌تی (٢٥)ی سووره‌تی (الأنبياء) و، له‌ ئایه‌تی (٢٥) سووره‌تی (الحدید)دا، كه‌ باسی خوا به‌یه‌كگرتن (توحید)و باسی دادگه‌ریی (قسط)ی ده‌كرێ، بناغه‌ی حوكمی ڕه‌شیدو، خه‌ڵك كردنه‌ خاوه‌ن و سه‌رچاوه‌ی ده‌سته‌ڵات (سلطة) داڕێژراوه‌، چونكه‌ بێگومان له‌سه‌ر بناغه‌ی خوا به‌یه‌كگرتن (توحید)و دادگه‌ریی (عدل)، ئه‌وه‌ ده‌چه‌سپێ، كه‌ خه‌ڵك خاوه‌نی ده‌سته‌ڵات بێ و، به‌رپرسانی خۆیان دابنێن و، چاودێریان بكه‌ن و، لێیان بپرسنه‌وه‌و، لایانبده‌ن له‌ كاتی ڕاست نه‌بوونه‌وه‌یاندا، ئه‌مه‌ش ده‌قی ئه‌و دوو ئایه‌ته‌ به‌ پێزه‌:

١- ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ٢٥ ﴾ الأنبياء.

واتە: وە لە پێش تۆدا "ئەی موحەممەد!" هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر پێمان ڕاگەیاندوە کە: جگە لە من هیچ پەرستراو نین، تەنیا من بپەرستن.

٢- ﴿ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ٢٥ ﴾ الحديد.

واتە: بە دڵنیاییەوە: پێغەمبەرانمان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە ناردوون و، کتێب و تەرازووشمان لەگەڵ ناردنە خوار، تاکو خەڵك بە دادگەریی بەڕێوەبچن، وە ئاسنیشمان دابەزاندوە، هێزێکی توندو سوود گەلێکی بۆ خەڵکی تێدان، وە تاکو "لە ئەنجامی جیهاددا" خوا بزانێ کێ لەگەڵ پەنهانییشدا "چونکە خوا نابینێ" خۆی و پێغەمبەرانی سەر دەخات، بێگومان خوا بەهێزی زاڵە.

ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: ئێمە ئیشکالێك، کە لەگەڵ دیموکراسیدا هەمانە، ئەوەیە کە حەڵاڵ و حەڕام دەداتە دەستی خەڵك، ئێمە بە شێوەیەکی بنەڕەتیی، تەنیا ئەو تێبینییەمان لەسەر دیموکراسی هەیە، چونکە دیاریی کردنی حەڵاڵ و حەڕام، عایدی خوایە، وە شورا لە ئیسلامدا شەریعەت پەرژینیەتی، بەڵام دیموکراسی بێ پەرژینە، بۆیە لەگەڵ ڕێزمدا بۆ ئەم کۆڕو مەجلیسە، ناچارم بڵێم: کاتێك دەبینن لە پەرلەمانەکانی ڕۆژئاوادا خێزانی هاورەگەزیی[1] بەیاسا ڕەوا دەکرێ، وە کاتێك دەزانین لە پەرلەمانەکانی وڵاتانی ئەورووپادا بڕیار درا، کە کوردستانی وڵاتی ئێمە، بەش بەش بکرێ، وە کە دەبیستین لەوێ بڕیار دەدرێ لەشکرکێشیی بکرێ و وڵاتان داگیر بکرێن، با پێمان سەیر نەبێ، چونکە دیموکراسییەکەیان، پەرژینێکی وەك شەریعەتی ئیسلامیی نیە، کە دەستیان بگرێ و لە لادان و ستەم، بیانگێڕێتەوە!

---

(١) واتە: دوو نێر، دوو مێ، پێکەوە خێزان پێکدێنن!

ئنجا با سەرنج بدەین!

**داخۆ دیموكڕاسی لە هەرێمی كوردستاندا، چۆنە؟**

١- ئایا وەك دیموكڕاسیی دەڵێ: "بەڵكو ئەوە گرنگترین پێكهێنەری ئەرێنی دیموكڕاسییە" خەڵك سەرچاوەی دەسەڵاتە؟ یان حیزب و بگرە حیزبیش مەزڵوومە، من حیزبە سیكۆلاریستەكان، بە مەزوڵوم دەزانم، چونكە هەندێ لە ئەندامی حیزبە حوكمڕانەكان دەناسم، دادو فیغانیەتی لە دەست شتێك لە حیزبیش بچووكتر، وەك تاك و بنەماڵەو گرووپ، كە هەر حیسابیش بۆ مەكتەب سیاسی و حیزب ناكات، با واقیع بینانە قسە بكەین.

٢- پاشان ئایا وەك دیموكڕاسی دەڵێ: لە هەرێمەكەماندا یاسا سەرووەرە، یان حیزب و ئاسایش سەرووەرە؟ خەڵكی ئێمە گیراوە، دوای ئەوەی بە قانوونەكەی خۆیان و، حاكمەكەی خۆیان ئیفراجی دەكات، ئاسایش بەری نادات! من جارێك بە كاك مەسعوودم گوت، كاك مەسعوود! من بۆت دەسەلمێنم، كە ئاسایش سەرووەرە، نەك یاسا، گوتی: چۆن؟ گوتم: كەسی وامان هەیە، بە یاسا بەری دەدەن، ئاسایشەكەتان ناهێڵێ بێتەوە ماڵێ.

٣- ئنجا هەڵبژاردنەكان، بێگومان هەڵبژاردن شتێكی باشە، بەڵام بە مەرجێك بەرجەستەكەری ئیرادەی ڕاستەقینەی خەڵك بێ، نەك ساختەكاریی و فشار كردنە سەر خەڵك و، تەخشان و پەخشانی پلەو ئیمتیاز، بۆ كڕینی ئیرادەو دەنگی خەڵك!

٤- ئنجا لێك جیاكردنەوەی دەسەڵاتەكان، بێگومان شتێكی باشە، چونكە چڕكردنەوەی دەستەڵات لە دەستی كەسێك، یان دامەزراوەو دەزگایەكدا، سەر دەكێشێ بۆ خۆسەپاندن (إستبداد)و قۆرخكاریی، بەڵام ئێمە وەك چێشتی مجێور، هەموو شتێكمان تێكەڵ كردوە، حكوومەت و حیزب و عەشیرەت و بنەماڵە، هەمووی پێكداچووە، كەس سەری لێ دەرناچێ.

٥- ئنجا كاری به دامه‌زراوه‌یی، كه یه‌كی دیكه‌یه له بنه‌مایه‌كانی سیستمی دیموكراسی، به‌ڵام كوان دامه‌زراوه‌كانی ئێمه؟! په‌رله‌مانێكی په‌ككخراو، حكوومه‌تێكی ئیفلیج، سه‌رۆكی هه‌رێمیش به‌پێی یاسا ماوه‌ی یاسایی به‌سه‌رچووه، بۆیه من ئێستا دامه‌زراوه‌یه‌كی سه‌لامه‌ت نابینم، له‌م هه‌رێمه‌ی خۆماندا!

٦- ئنجا دابین كردنی ماف و ئازادییه‌كان، كه پایه‌یه‌كی دیكه‌ی دیموكراسییه، ده‌ڵێم: ماف و ئازادییه‌كان تاراده‌یه‌ك هه‌ن، له هه‌رێمی كوردستاندا، به‌ڵام ته‌نیا ئه‌و سنووره‌و، زیاتر ئه‌و ماف و ئازادییانه‌ش، كه زه‌ریان بۆ په‌زه‌كان نه‌بێ!

**له كۆتایی دا ده‌ڵێم:**

١- به حوكمی مسوڵمان بوونم، ئیمان و عه‌قیده‌كه‌م له‌سه‌ری پێویست كردووم، كه دڵسۆزو ڕاست و ساغ بم، وه به په‌رۆش بم بۆ هه‌موو كه‌س به‌گشتی، به‌تایبه‌ت بۆ خه‌ڵك و وڵاتی خۆم، وه له ڕابردووشدا له هه‌موو ئاسته‌كاندا، چی به باشم زانیبێ، دڵسۆزانه‌و به ڕوون و ڕاشكاویی گوتوومه‌و ڕامگه‌یاندوه، بۆیه زۆر به ڕوونیی و زۆر به ڕاشكاویی به‌ڕێزان! چینی سیكۆلاریستی كاربه‌ده‌ست له هه‌رێمی كوردستاندا! فه‌شه‌لێكی گه‌وره‌و حاشا هه‌ڵنه‌گرتان هێناوه، له به‌ڕێوه‌بردنی هه‌رێمه‌كه‌ماندا! نه سیكۆلاریزمتان سیكۆلاریزمه، نه دیموكراسیتان دیموكراسییه، وه ئه‌و بنه‌مایانه‌ی، كه ئه‌و دووه‌یان لێ پێكهاتوون، من هیچیان وه‌ك پێویست نابینم، بێ ئینصاف نیم، به‌ڵام په‌رۆشی ئه‌م خه‌ڵك و میلله‌ته‌مه، كه ئێوه تاكو ئێستا به‌و شێوه ئیداره‌ی ئه‌م وڵاته‌تان كردوه، دوای (٢٥) ساڵ، دوای چواریه‌كه سه‌ده‌یه‌ك، بۆیه چاو به‌خۆتاندا بگێڕنه‌وه.

٢- عه‌لمانیه‌تی هه‌رێم، وه‌ك چێشتی مجێور وایه، هه‌موو شتێكی تێدایه: حوكمی بنه‌ماڵه‌یی و میراتیی، خۆسه‌پاندن، به پیرۆز گرتنی ده‌سه‌ڵات، بۆیه ده‌ڵێم: گوناهتان ده‌گات چیدی ئه‌و چێشته خراپه، ده‌رخوارده‌ی ئه‌م میلله‌ته‌ی خۆتان مه‌ده‌ن، ئه‌گه‌ر هه‌ر ده‌تانه‌وێ حوكمڕان بن، چێشتێكی باش بۆ ئه‌م خه‌ڵكه ساز بكه‌ن!

٣- خزمەت کردنی خەڵك و جەماوەر، ئەرکی حکوومەت و دەسەڵاتە، چی دیکە پێیان مەفرۆشنەوە، بە نرخی کڕینی دەنگ و ئیرادەیان.

ئنجا با دوو سێ قسەش لەبەر ئەو میوانەی کە لە فەڕەنساوە هاتوە[1]، بۆ ڕۆژئاواییەکان بکەین:

١- ئێوە سیکۆلاریزم و لائیکیزمەکەتان، هەرچەندە لە کڵێساو ثیۆکڕاسیی دەربازی کردوون، بەڵام تووشی زۆر دەردو نەهامەتیی دیکەی کردوون، بەتایبەت پووچگەرایی[2]، پاشان ئەوەندە بەسە، کە ئێستا زانست لە خزمەت چەکی کۆکوژیی و خۆ کوژیی دایە!

٢- دیموکڕاسییەکەشتان بە هۆی تاکگەرایی: لیبرالیزم (Liberalism) و کاپیتالیزم (Capitalism) خەریکە پێچەوانەی خۆی دەبێتەوە، خەریکە لە جیاتی ئەوەی حوکمی خەڵك بێ بۆ خەڵك، ببێتە حوکمی کەمینەیەکی پارەدار، بەسەر خەڵکێکی نەدارو هەژارو بێ چارەدا، بۆیە ئەگەر بگوترێ: لە ڕۆژئاوا کێ پارەی زیاترە، دەنگی بەهێزترە، زۆر ڕاستە.

٣- واقیعی دژوارو چەوساوەیی گەلی کورد، بەرهەمی بیرکردنەوەی سیکۆلاریستانەو بڕیارە دیموکڕاسییەکانی ئێوەیە، ئینصافێکتان هەبێ، نەدەبوو ئەم میللەتەی ئێمە ئاوا وەك گۆشتی خێرێ ببەخشرێتەوە، کە بە داخەوە لە پەرلەمانەکانی خۆتاندا بەو جۆرە بڕیارتاندا![3]

٤- ئەگەر دیموکڕاسیتتان بۆ خۆتان پێ باشە، بۆ ئێمەش پێتان باش بێ، ئێمەش

---

(١) مەبەستم (پرۆفیسۆر میشێل ڤیڤیۆرکا) بوو.

(٢) فەلسەفەیەکی ڕۆژئاوایی یە، کە ئایین و بنەمایەکانی ڕەت دەکاتەوەو بێ هوودە دەزانێ، بە عەرەبی (العبثیة)ی پێ دەڵێن، بە ئینگلیزیی (Ninilisn).

(٣) مەبەست پەیمانی شوومی (سایکس - بیکۆ)یە کە لە ساڵی (١٩١٦ ز)دا لە نێوان فەڕەنساو بەریتانیاو ڕووسیادا ئیمزا کراو، یەکێك لە دەرهاویشتەکانی دابەشکردنی کوردستان بوو.

مرۆڤین، ئنجا کاتێك لە هەڵبژاردنەکاندا، خەڵکێکی ئیسلامیی دەیباتەوە، بۆچی ڕێگا دەدەن، کە کودەتایان بەسەر دابکرێ، کە لە جەزائیرو فەڵەستین و لە میسر، زۆر بە ئاشکرا دیار بوو؟

٥- هیوادارم کە خەڵکی ڕۆژئاوا بە تایبەت سیاسییەکانیان، چیدیکە هەڵەو پەڵەی گرووپە پەڕگیرەکان بە تایبەت (داعش)، لەسەر ئیسلام حیساب نەکەن، چونکە ئیسلام دینی سەماحەت و ڕەحمەتەو، ئەوانە بوونە مایەی سەر ئێشەو زەحمەت، لەسەدا نەوەدو پێنجی(٩٥٪)ی تەوژمیی ئیسلامیی، هاوسەنگە، بەڵێ هەندێك گرووپی پەڕگیرمان هەن، کە ئەوانیش بە هۆی ئەم واقیعە نەخۆشەوە پەیدابوون.

٦- با چی دیکە ڕژێم و حیزبە سیکۆلاریستەکان، ئێمە لە ئێوە نەکەنە داوەڵ و، ئێوە بە ئێمە نەترسێنن، کە پێتان بڵێن: لە پشت ئێمەوە بن، دەنا ئیسلامییەکان جێگای مەترسیین!! نەخێر لایەنە ئیسلامییەکان لەگەڵ دیموکراسیی ڕاستتر دەکەن، ئەو لایەنە ئیجابییانەی، کە لەگەڵ شەریعەتدا تێك ناگیرێن، وە لەگەڵ هەموو ئەو مەبدەئو بەها بەرزو مرۆییانەدا، ڕاستتر دەکەن، وە ئێمە واقیعی ژیان و کردارییشمان دیارە، چ نەمانگوتوە مارکسیی و چەپین، بەڵام ژیانێکی سادەو نەدارانەمان هەیەو، لەگەڵ میللەتی خۆماندا دەژین، وە خەڵکی دیکەش لافی چەپگەرایی لێدەدەن، کەچی ژیانێکی زۆر خۆشگوزەرانانە دەژین و ملیاردێرو ملیۆنێرن! گرنگ ئەوەیە ئینسان لەگەڵ مەبدەئەکانیدا ڕاست بکات، ئەگەرنا وەك گوتراوە: (بە حەلوا حەلوا، دەم شیرین نابێ) بە بێ کردار، شیعار هیچی لێ هەڵناوەرێ!

٧- ئیسلام و مسوڵمانان گرفت و کێشەیان لەگەڵ حیزب و ڕژێمە خۆسەپێن و دیکتاتۆرەکاندا هەیە، نەك دیموکڕاسی، جگە لە مەسەلەی دیارییکردنی حەڵاڵ و حەرام.

## دەستپێك

زۆر سوپاسی كاك مەلا بەختیار دەكەم، هەرچەندە هەستم كرد، زیاتر ئێمەی بردەوە بۆ مێژوو، من حەزم دەكرد زیاتر قسە لەسەر واقیع بكات، وەك من باسم كرد، چونكە ئەگەر سیكۆلاریزمە، ئەگەر دیموكڕاسییە، ئەگەر سیستمی حوكمڕانیی ئیسلامییە، بۆ ئەوەیە لە واقیعدا بەرجەستە بكرێ، كە ئێمە پێمان وایە ئیسلام بەدیلە بۆ سیكۆلاریزم، وە لایەنە ئیجابییەكانی دیموكڕاسیی تێدان، وە ناكۆكییشی نیە لەگەڵ زۆربەی بنەماكانیدا، وەك میكانیزمی حوكمڕانیی، بەڵام ئیسلام بەدیلە بۆ سیكۆلاریزم، خەڵكی ڕۆژئاوا ناچار بوون پەنابەرن بۆ سیكۆلاریزم، بەڵام خەڵكی ئێمە هیچ ناچار نین، چونكە هەرچی چاكیی لەوێدا هەیە، لە ئیسلامەكەیدا هەیە، بە باشتر، وە لە خراپە و خاڵە نەرێنییەكانیشی دوورە، ئنجا من پێم خۆش بوو، زیاتر قسە لەسەر واقیع بكات، بە هەر حاڵ ئەوە بۆ خۆی دەگەڕێتەوە.

بەڵام من پابەند بووم بە ناوونیشانی دیبەیتەكە: (سیكۆلاریزم و دیموكڕاسیی لە ئەزموونی هەرێمی كوردستاندا)، لەو چوارچێوەیەدا هەوڵمدا قسە بكەم.

هەڵبەتە كاك مەلا بەختیار چەند شتێكی ورووژاندن، من بە خێرایی بەسەریاندا دەڕۆم:

**یەكەم: دەڵێ: خۆزگە باسێكی هەڵەی ئیسلامییەكانی بكردبایە؟**

**وەڵام:** بە تەئكید باس باسی ئیسلامییان نەبوو، بەڵكو باسی سیكۆلاریزم و باسی دیموكراسیی بوو، بۆیە دەبوایە هەر باسی ئەوە بكەم، بەڵام ئێمە ئەگەر

دانیشتبایین لەسەر باس و خواس و مشت و مڕ لەسەر دەوڵەتی ئیسلامیی و تەوژمی ئیسلامیی و ئیسلامییەکان، کە ئایا چییان پێیە؟ ئەو کاتە باسی کەم و کوڕیی ئیسلامییەکانیشمان دەکرد، بە تەئکید ئیسلامییەکان فریشتەی بێ هەڵەو بەفری بێ پەڵە نین، بەڵام باس ئەو باسە نەبوو، وە من سوپاسی ئینصافی کاك مەلا بەختیار دەکەم، کە گوتی: هیچ لارییم نیە لە وتەکانی مامۆستا، وە زۆر کەم و کوڕیی دیکەش هەن و، قسەی زیاتریش هەڵدەگرن، بۆیە پێمەش ئەو قسە زۆرانە بۆ کاتێکی دیکە هەڵدەگرین[1]، ڕاستە ئەوەی لەبارەی واقیعی هەرێمەوە گوتمان، زیاتریش هەڵدەگرێ، وە بە حەقیقەت من کە باسی کەم و کوڕییەکانی خۆمان دەکەم، لەم هەرێمی کوردستانەدا، وەك پێشینان دەڵێن: (دۆست ئەوەیە کە دەتگریەنێ، دوژمن ئەو کەسەیە دەتهێنێتە پێکەنین)، من پێم وایە دەبێ دڵسۆزیی ئێمە بۆ هەرێمەکەمان، بۆ ئەزموونەکەمان، بۆ خەڵك و جەماوەرەکەمان، جورئەتی ئەوەمان پێبدا، کە نوقتە بخەینە سەر پیت، پەنجە بخەینە سەر نەخۆشییەکان، ئەگەرنا بەخاتری یەکدی گرتن و موجامەلە، هیچمان پێ ناکرێ.

ئنجا چینە سیاسییە حوکمڕانەکەی هەرێمی کوردستانیش، زۆربەی دۆست و ناسیاون، وە من بە باشی نازانم خۆم لە کەس دابڕم، مەگەر کەسێك دەرگامان لەسەر دابخات و خۆیمان لێ دابڕێ، ئەگەرنا من بڕوام بە دابڕان نیە، وە بڕوام بەقسە لەگەڵ یەکدیدا نەکردن نیە، بۆیەش زۆر جار ڕۆڵم بینیوە، کە دوولایەنی ناکۆکی عەلمانیی پێکەوە ئاشت بکەمەوە، چونکە ئێمە ئەگەر بەهەموومان شتێکمان بۆ بکرێ، دەکرێ، ئەگەرنا بەلێك جیایی و بەپشت تێککردن، هیچمان پێناکرێ.

**دووەم: کاك مەلا بەختیار دەڵێ: ئێمەی عەلمانیی نەبووین مەککەمان ڕووخاند؟**

**وەڵام:** من باسی ئەوەم نەکردوە، ئەگەر ئەو دەیەوێ وەڵامی من بداتەوە، من باسی ئەوەم نەکردوە، بۆیە پێم وایە ئەو بەرپەرچی قسەیەك دەداتەوە، کە من نەمکردوە؟

---

(١) لە کتێبی: (ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان) دا بەدرێژی لەو بارەوە دواوین.

**سێیه‌م: ده‌ڵێ: سێ خه‌لیفه‌ی ڕاشیدین كوژراون، وه‌ بنه‌ماڵه‌ی پێغه‌مبه‌ر (علیه الصلاه والسلام)، وه‌ (حسین) كوژراون و سته‌میان لێكراوه‌؟**

**وه‌ڵام:** ڕاسته‌، ئه‌وانه‌ هه‌موویان خراپ بوون، به‌ڵام خۆ من خه‌ڵكی عه‌لمانییم به‌وه‌ تۆمه‌تبار نه‌كردووه‌!! ئنجا سێ خه‌لیفه‌ی ڕاشید، كه‌ ده‌كوژرێن، له‌ ڕاستییدا ئه‌مه‌ خاڵی هێزه‌ بۆ ئیسلام، چونكه‌ كلتووری ئه‌و كاته‌ی حوكمڕانیی، له‌سه‌رجه‌م وڵاتانی دنیادا، وه‌ دواكه‌وتوویه‌تیی كۆمه‌ڵگا، ته‌حه‌ممولی فیكری حوكمی ڕاشیدیی نه‌كرد، چونكه‌ له‌ سه‌رده‌می حوكمی خه‌لیفه‌ ڕاشیده‌كاندا، خه‌ڵك هه‌موویان یه‌كسان بوون، وه‌ خه‌ڵك له‌ نێوان خۆیاندا كامه‌یان به‌ باشتر ده‌زانی و، كامه‌یان زیاتر خاوه‌ن كه‌فائه‌ت بوون، ئه‌وانه‌یان ده‌كرده‌ به‌رپرسی خۆیان، به‌بێ ڕه‌چاوكردنی بنه‌ماڵه‌و تیره‌و ڕه‌گه‌زو پاره‌و سامان و وه‌جاخ و ئه‌وانه‌، به‌ڵام سه‌ره‌نجام كه‌سانێك كه‌ چاویان له‌ قۆرخكاریی و سته‌م بوو، ئه‌وه‌یان ته‌حه‌ممول نه‌كرد: ئومه‌وییه‌كان هاتن كوده‌تایان كرد به‌سه‌ر خیلافه‌ی ڕاشیدیدا، كه‌ ئه‌وه‌ش فه‌رمایشتی پێغه‌مبه‌ره‌ (صلی الله علیه وسلم) فه‌رموویه‌تی: {أَوَّلُ مَنْ يَغَيِّرُ سُنَّتِي رَجُلٌ مِنْ بَنِي أُمَيَّةَ} (أَخْرَجَه ابْنُ أَبِي عَاصم في (الأوائل) (ج٧، ص٢)، قَالَ الألباني: وَهَذَا إِسْنَادٌ حَسَنٌ، رِجَالُهُ ثِقَات رِجَالُ الشَّيْخَيْنِ غَيْرَ المُهَاجِر وَهُوَ ابْنُ مُخَلَّد، وَلَعَلَّ المُرَاد بالحَدِيث تَغِيير نِظَام اختيَار الخَلِيفَة وَجعله وراثة)، واته‌: یه‌كه‌مین كه‌سێك كه‌ ڕێ و شوێنی من ده‌گۆڕێ (واته‌: ڕێ و شوێنی حوكمڕانیی) پیاوێكه‌ له‌ به‌نی ئومه‌ییه‌، كه‌ ئه‌لبانی ده‌ڵێ: ڕه‌نگه‌ مه‌به‌ست پێی دانانی شێوه‌ی دانانی خه‌لیفه‌و حوكمڕانی بێ، كه‌ له‌ ڕاوێژه‌وه‌، گۆڕا بۆ میراتیی و بنه‌ماڵه‌یی.

لێره‌وه‌ ئینحیراف دروست بووه‌، به‌ڵێ، ئێمه‌ ده‌زانین، كه‌ خه‌لیفه‌ ڕاشیده‌كان كوژراون، وه‌ زانایانی ئیسلام سجن كراون، به‌ڵام ئه‌مه‌ خاڵی هێزه‌ بۆ ئیسلام و، خاڵی هێزه‌ بۆ زانایانی ئیسلام، كه‌ ئاماده‌ نه‌بوون سازش بكه‌ن له‌سه‌ر مه‌بده‌ئه‌كانیان، له‌گه‌ڵ ده‌سه‌ڵاتدا، ئێستاش هه‌ر ئه‌وه‌ له‌ ئێمه‌ داواكراوه‌، هه‌ر ئه‌وه‌ له‌ ماموٚستاو ڕۆشنبیرو نووسه‌ران داواكراوه‌، كه‌ به‌ زار چه‌ور كردنێك و به‌ ته‌ماع وه‌بەر نانێك و، به‌ دوو هه‌ڕه‌شه‌و گوڕه‌شه‌، ته‌نازول له‌ مه‌بده‌ئه‌كانی خۆمان نه‌كه‌ین، كه‌ به‌ ڕاست و

چاکیان دەزانین بۆ میللەتی خۆمان، وە پێداگیریی بکەین لەسەر ئەوەی کە ئەم وەزعە دەبێ ڕاستبێتەوەو، چاکسازیی و پاکسازیی تێدا بکرێ.

ئنجا زانایانی ئیسلامیش هەروایان کردوە: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل کە (لە ڕای خۆی دەربارەی قورئان) تەنازول ناکات، شافیعی، کە (لە عیراق) دەردەکرێ، ئەبو حەنیفە کە (لەسەر نەبوونی بە قازیی عەبباسییەکان) سجن دەکرێ، مالیك کە (لەسەر پشتگرتنی ڕاپەڕین لە دژی حوکمڕانانی ستەمکاری ڕۆژگاری خۆی) لێی دەدرێ، دەبێ لەسەر ئەوە، مەدالیای شەرەفیان پێ هەڵبواسرێ، وە ئەوە نیشانەی زیندوویەتیی ئیسلام و، نیشانەی ڕەسەنایەتیی ئەو زانایانە بووە (ڕەزای خوایان لێ بێ).

**چوارەم: بە نسبەت دوو جەنگە جیهانییەکە باسی کردن.**

**وەڵام:** منیش پشتگیریی دەکەم، لە جەنگی جیهانی یەکەم و، لە جەنگی جیهانی دووەمدا، بەپێی هەندێ سەرژمێر، نیزیکەی (٧٠) ملیۆن کەس زیاتر، یان کەمتر، کوژراون، بەڵام کوژراوی هەموو جەنگەکانی عالەمی ئیسلامیی خڕ بکەیەوە، لەو کاتەی، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەبووە، هەتا دوایی نیوەی نیوەی ئەمەش نابن، وە هەموو کوژراوەکانی جەنگەکانی ڕۆژگاری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناگەنە هەزار (١٠٠٠) کەس.

**پێنجەم: ئەوەی کە زۆر سەرنجی منی ڕاکێشا، ئەوەبوو کە گلەییەکیشی لە صەلاحەددینی ئەییوبی کرد، کە حوکمی فاتیمییەکانی لە میسر نەهێشتوە؟!**

**وەڵام:** دوا خەلیفەی فاتیمیی (العاضِد) کە شاعیرێك پێی دەڵێ: (فَاحْكُمْ فَأَنْتَ الوَاحِدُ القَهَّارُ)، واتە: حوکم بکە تۆ تاکی مل پێکەچکەری، کە ئەوە شیۆکڕاسییەکی زۆر خراپ بووە[1]، وە خەڵکی وەك کۆیلە تەماشا کردووە، حوکمی فاتیمییەکان حوکمێکی شیعیی پەڕگیر (متطرف)ی تائیفیی، بووە، ئنجا ئێمە صەلاحەددینمان هەیە، کە شانازیی پێوە بکەین، ئەویش لەبەر ئەوە ڕەخنەی لێبگیرێ، کە حوکمێکی

---

(١) بگرە ئەو قسەیە بە کوفرو شیرك دادەنرێ.

تائیفیی ده‌مارگیری خراپی نه‌هێشتوه‌، پێم وایه‌ ئه‌وه‌ بێ ئینصافییه‌ به‌رانبه‌ر به‌صه‌لاحه‌ددین.

**شه‌شه‌م: به‌ نسبه‌ت كوشتنی خه‌لیفه‌كانی عه‌باسییه‌كانه‌وه‌، زۆر قسه‌ی كردن.**

وه‌ڵام: به‌ڵێ، ئێمه‌ش ده‌زانین كه‌ له‌ مێژووی مسوڵماناندا، كه‌م و كوڕیی زۆر بووه‌، به‌ڵام كه‌م و كوڕییه‌كان ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ لادانی خه‌ڵكه‌كه‌ له‌ ئیسلام، به‌ڵام هی نه‌صرانییه‌كان ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ خودی دینه‌ تێكدراوه‌كه‌یان، بۆ خودی كتێبه‌ پیرۆزه‌كه‌، كه‌ تێكدراوه‌، ئه‌گه‌رنا ئه‌و كتێبه‌ی كه‌ خوای كارزان ناردوویه‌تی، به‌و شێوه‌یه‌ نه‌بووه‌.

**حه‌وته‌م: به‌ نسبه‌ت عه‌لمانییه‌ته‌وه‌، كه‌ ببه‌سترێته‌وه‌، به‌ كوشت و كوشتاره‌وه‌.**

وه‌ڵام: به‌ پێچه‌وانه‌وه‌، من گوتم: كڵێسای نه‌صرانییه‌ت، كوشت و كوشتاری كرد، كڵێسا دادگای ته‌فتیشی دانا، دوایی عه‌لمانییه‌كان هاتن به‌رپه‌رچی ئه‌وه‌یان دایه‌وه‌، وه‌ عه‌لمانییه‌كان و جموجۆڵی عه‌لمانییه‌كان باجی گه‌وره‌یانداو سووتێنران، من ئاوام گوت، ڕه‌نگه‌ چاك له‌ قسه‌ی من تێنه‌گه‌یشتبێ.

**هه‌شته‌م: گوتی: عه‌لمانییه‌ت له‌گه‌ڵ ئیلحاددا نیه‌.**

وه‌ڵام: من له‌ سه‌ره‌تاوه‌ گوتم: له‌ نێو عه‌لمانییه‌كاندا بگه‌ڕێ، ده‌بینی: خه‌ڵكی خوانه‌ناس و مولحید بووه‌، وه‌ خه‌ڵكی خواناسیشیان تێدا بووه‌[1]، هه‌ڵبه‌ته‌ ئێمه‌ تێبینییشمان له‌سه‌ر ئه‌و جۆره‌ خواناسینه‌ش هه‌یه‌، كه‌سێك بڵێ: من خوا ده‌ناسم، خوا هه‌قه‌، به‌ڵام دینه‌كه‌ی به‌ كه‌ڵك نایه‌ت!! ئه‌وه‌ ده‌بێ چ جۆره‌ خواناسینێك بێ، ئه‌وه‌ پێی ده‌ڵێن: (شه‌ل نیه‌، به‌ڵام پای شكاوه‌)! كاتێك تۆ بڕوات به‌ خوا هه‌یه‌، كه‌ خوا قورئانی ناردوه‌و، پێغه‌مبه‌ری ناردوه‌، وه‌ هه‌ردووكیانی بۆ هه‌موو به‌شه‌ری ناردوون، چۆن ده‌ڵێی: خوایه‌! دینه‌كه‌ت به‌ كه‌ڵك نایه‌ت؟ وه‌ چۆن ئه‌وه‌ی كه‌ خوا حه‌ڵاڵی كردوه‌، به‌ حه‌ڵاڵی دانانێی، وه‌ ئه‌وه‌ش كه‌ به‌ حه‌ڕامی داناوه‌،

---

(١) خواناس (معتقد بالله) له‌: بڕوادار به‌ خوا (مؤمن بالله) جیایه‌، بۆ وێنه‌: ئیبلیس خوای زۆر باش ناسیوه‌، به‌ڵام بڕوادار (مؤمن) نه‌بووه‌.

تۆ بە حەرامی دانانێی؟! بێگومان ئەوە لەگەڵ ناوی مسوڵماندا ناگونجێ، کە تۆ مسوڵمانی، مسوڵمان (مسلم) یانی ملکەچ بۆ خوا، بۆیە ئەوە کە خوا ناردوویەتی، دەبێ قبووڵت بێ، دەشتوانی بڵێی: قبووڵم نیە، ئەو کاتەش نامسوڵمانی و تەواو، بەڵام تۆ کە مسوڵمانی، دەبێ بڵێی: مادام خوا فەرموویەتی، وە بە ئێمە گەیشتوە، قبووڵمە، تازە دەبێ بیسەلمێنی و ملکەچی بی.

**نۆیەم: بە نسبەت ئەوەوە کە عەقڵی ئینسان دەبێ چەق بێ و، عەقڵی ئینسان دەبێ ئازادبێ!**

**وەڵام:** ئێمەش هەروا دەڵێین: ئەسڵەن زانایانی ئیسلام دەڵێن: (العَقْلُ مَنَاط التَّكْلِيف)، تەکلیف بە عەقڵەوە بەستراوەتەوە، شێت هیچ تەکلیفی لەسەر نیە، منداڵ تەکلیفی لەسەر نیە، بۆچی؟ چونکە عەقڵی کامڵ نەبووە، یان عەقڵی نیە، وە لە ئیسلامدا زۆر گرنگیی بە عەقڵ دراوە، وە ئەوە هەر موعتەزیلەکان نەبوون، کە بایەخیان بە عەقڵ داوە، بەڵکو هەموو دواندن (خطاب)ەکانی قورئان، ڕوویان لە عاقڵ مەندانە، بۆ وێنە: خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢﴾ ﴾ یوسف.

هەروەها دەفەرموێ:

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾ البقرة.

کەواتە: هەر کەسێك عەقڵی نەبێ، قورئان هەر ڕووی تێناکات، قورئان هەرنایدوێنێ، قورئان عاقڵان دەدوێنێ، قورئان کەسانێك دەدوێنێ، کە تێی دەگەن و فامیدەو شارەزان.

**دەیەم: بە نسبەت ئەوەوە کە گوتی: هەموو لایەك لە تازەگەریی و مۆدێرنێتە (حداثة) بەهرەمەندین.**

**وەڵام:** ڕاستە، بەڵام ئایا مۆدێرنێتە (Modernita) بە شەوو ڕۆژێك پەیدابووە؟ ئایا ئەو مۆدێرنێتە وەك کارگێك بووە، هەر لەو گۆڕە هەڵتۆقیوە، دوایی پەڵە بارانێك؟

نەخێر، مۆدەرنێتە، کلتورو کەلەپووری کۆی بەشەرە: کاتی خۆی لە لای هیندەکان بووە، ئنجا یۆنانییەکان خستوویانەتە سەری، پاشان میسر، ئنجا میزۆپۆتامیا خستوویەتە سەری، دوایی ڕۆمەکان، پاشان دەوڵەتی ئیسلامیی، لە ئەنجامی کەڵەکەبوون (تراکم)ی هەموویدا، ئەو تەکنۆلۆژجیاو مۆدێرنێتەیە پەیدابووە، ئەدی کاك مەلا بەختیار! نابێ دان بەوە دابنێین، کە ڕۆژهەڵاتناسەکانیش دانیان پێداناوە، کە دوای شەڕی خاچ پەرستەکان و، دوای تەرجەمەی کتێبەکانی ئیبن ڕوشدو کتێبەکانی دیکەی زانایان، ڕێنیسانس لە ئەوروپا سەری هەڵدا؟ کەواتە: ئەوە میرات و کەلەپووری هەموو بەشەرە، ئەوە نە بە تەنیا ئەورووپا خاوەنیەتی، نە یۆنان و نە گریك و نە مسوڵمانان و نە هیندو نە چین، بەڵکو هی هەموو بەشەرە، چونکە تەکنۆلۆژیاو شارستانییەت دەستاودەست دەکات، جارێك لەوێ بووە، جارێك لەوێ، بەڵام ئێستا حاڵەتێکی عەولەمەیی وەرگرتوە، ئینکاریی ناکرێ، کە ئەورووپیەکان زۆریان خستە سەری، بەڵام ئەوانیش لە سفرەوە دەستیان پێ نەکرد، بەڵکو کتێبی زانا مسوڵمانەکانیان وەرگێڕان، وە مسوڵمانەکانیش کاتی خۆی کتێبی یۆنانییەکانیان وەرگێڕان، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئیسلام لاری نیە لە سوود وەرگرتن لە ئەزموون و فیکری هەر کەسێك، بەرهەم و کتێبی نامسوڵمانانیش، مادام مسوڵمانان لێی بەهرەمەندبن، ئیسلام دەستیان ناگرێ کە سوود لە حیکمەت و زانستی هەر کەسێك وەربگرن[١].

پێم وایە کاك مەلا بەختیار زۆر چووە نێو مێژووەوە، هۆیەکەشی ئەوە بوو، کە وەك پێویست دیفاعی بۆ لەم واقیعەکە ناکرێ، ئەم واقیعەی، کە هەڵبەتە خەڵکی ئیسلامیی لە هەرێمی کوردستاندا بەرپایان نەکردوە، بەڵکو ئەم واقیعە، حوکمڕانە سیکۆلاریستەکان بەرپایان کردوە، ئنجا لەبەر ئەوەی لەو جەبهەیەوە

---

(١) لە شوێنەوار (أثر)دا هاتوە: (الحكمة ضالة المؤمن فحيث وجدها فهو أحق بها) أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٢٦٨٧)، وَقَالَ: غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٦٩)، واتە: حیکمە بزر بووی بڕواداره، لە هەر جێیەك بیدۆزنەوە لە هەموو کەس پێی شایستەترە.

هەستی بە زوعف دەكرد، پەڕیەوە بۆ قوولآیی مێژوو، كە بابەتەكەمان بابەتی مێژوو نەبوو.

**یازدەیەم: كە دەڵێ: دیموكڕاسی لە كەیەوە سەری هەڵدا؟**

**وەڵام:** من گوتم: وشەی دیموكراسی بەڵێ لە یۆنانەكانەوە داهاتوە، بەڵام نێوەڕۆكی دیموكڕاسیی نا، ئنجا وەك زانایان دەڵێن: (العبرة بالمحتويات والمضامين، وليست بالأسماء والعناوين) واتە: جێی سەرنج و پەند نێوەڕۆك و مەبەستەكانن، نەك ناوونیشانەكان، ئەوە نێوەڕۆكی دیموكڕاسییە، كە خەڵك بە گشتی خاوەنی دەسەڵات بێ، ئنجا من دەڵێم: ئا ئەوە قەدیم ترە لە یۆنان، ئنجا خۆ مەعقوول نیە، بڵێی: تاكو یۆنانییەكان لە دایك نەبوون، خەڵك عەقڵی نەبووە، خەڵك عەقڵ و فیترەتی ساغی هەر بووە، بەشەر هەربەشەر بووە! وەك چۆن ئەزموونی شكست خواردووی حوكمڕانیی هەبووە، ئەزموونی سەركەوتووشی هەبووە، وە من ئیشارەم بە چەند كتێبێكی مێژوویش كرد، كە هەر ئەورووپاییەكان خۆیان نووسیویانن.

**دوازدەیەم: وە دەڵێ دیموكڕاسی ئەوە نیە كە خوا لابچێ!**

**وەڵام:** منیش ناڵێم دیموكڕاسی ئەوەیە، كە خوا لابچێ! بەڵام دەڵێم: دیموكراسی چوارچێوەیەكی نیە، كە بیپارێزێ، لەوە كە شتێك بڵێ لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا تێك بگیرێ، بۆ ئێمەی مسوڵمان، ئەگەرنا دەڵێم بۆ كەسێكی نامسوڵمان، بۆ كەسێكی ڕۆژئاوایی حەقی خۆیەتی، بەڵام لە لای ئێمەی مسوڵمان: ڕیبا حەرامە، زینا حەرامە، قەتل حەرامە، دزیی حەرامە، نوێژ واجبە، ڕۆژوو واجبە، عەدل واجبە، زوڵم حەرامە، وە ئەو شتەی كە خوا واجبی كردوون، واجبن، تاكو ڕۆژی قیامەت، وە ئەو شتانەی كە خوا قەدەغەی كردوون، قەدەغەن، تاكو ڕۆژی قیامەت، ئێمە وەك میللەتێكی مسوڵمان، دەبێ بەچوارچێوەی شەریعەتەوە پابەند بین، چونكە شەریعەتی خوا، هیچ شتێكی قەدەغە نەكردوە، مەگەر بۆ تاك و كۆمەڵ و دنیاو قیامەت، خراپ بێ، وە هیچ شتێكیشی واجب نەكردوە، كە بۆ تاك و كۆمەڵ و دنیاو قیامەت، باش نەبێ.

**سێزدەیەم: دەڵێ: دەوڵەتە ئیسلامییەکان قسەی خێریان نەکردوە، بۆ ئێمەی گەلی کورد کاتێك ڕژێمی بەعس قەتڵ عامی دەکردین!**

**وەڵام:** ئەو دەوڵەتانە[١] هەر ئەو ڕژێمە ستەمکارو خۆسەپێنانە بوون، کە ئیددیعای سیکۆلاریستییەتیی دەکەن و، ئیددیعای دیموکراسیی دەکەن، بەڵام کابووسن بەسەر سینەی خەڵکەکەوە، ئایا ئێمە لەسەردەمی ڕژێمدا، بۆچی وڵاتی خۆمان بەجێهێشت و چوو بووین بۆ شاخ؟ چونکە ڕێی نەدەدا کەس نەفەس بدات، ڕێی نەدەدا کەس چوار قسە بکات.

**چواردەیەم: هەروەها باسی بێ هەڵوێستیی لایەنە ئیسلامییەکانی کرد، لەوبارەوە.**

**وەڵام:** من پێم وایە نابێ گلەیی لە ئیسلامییە بێ چارەو بێ دەستەڵاتەکان بکرێ، کە لە کونجی زیندانەکان دابوون، لە میسرو لە کوێ و کوێ، وە ئێستاش هەر لە کونجی زیندانەکان دان، دوای ئەوەی کە ڕەوایەتییشیان لە خەڵك و شەقام وەرگرت، (عبدالفتاح سیسی) کاتێ کودەتا دەکات بەسەر شەرعییەت و ئیرادەی جەماوەرێکی زۆری مسوڵماندا، تۆ هیچ گلەیی لێ ناکەی، هەرچەندە دیموکراسی پێشێل کردوە! بەڵام گلەیی لە (محمد مرسی) دەکەی! گلەیی چی لێ دەکەی، کە کاتی خۆشی لە زیندان دابووەو، دیفاعی پێ لە تۆ نەکراوە؟! وە ئەگەر کەمتەرخەمیشیان بووبێ، کەمتەرخەمیی هەر کەمتەر خەمییە، دیفاع لە هەڵەی هیچ کەس ناکەم، چونکە بێگومان مەزلوومیەتێکی زۆر کەوتۆتە سەر گەلی ئێمەو، دەبوایە دیفاعیان لێکردبایەن، بەڵام کەسێك لەزیندان دابێ و مەجالی قسەی نەبێ، من گلەیی چی لێبکەم؟ ئنجا ئیخوان بێ، یان سەلەفیی بێ، یان هەر کەسێکی دی بێ!

**پازدەیەم: وە باسی مقاوەمەی کرد، گوتی: ئێمە بووین کە مقاوەمەمان کرد.**

**وەڵام:** ئەو قسەیە ڕاستەو نکوولیی لێ ناکرێ (بە تایبەت یەکێتی نشتیمانیی) ئێمەش هەرچەندە وەك ئیسلامیی درەنگ فریا کەوتین، بەڵام ئێمەش دوایی

---

[١] کە ئەو بە دەوڵەتە ئیسلامییەکان ناویان دێنێ!

مقاوەمەمان کردو، شتێکی باشمان کرد، بەڵام من نەمزانی ئەمە چ پەیوەندییەکی بە بابەتەکەی ئێمەوە هەبوو؟ ئەگەرنا بێگومان هەر لایەکمان کە دژی ڕژێمی بەعس جەنگاوین و بەرگرییمان لە خەڵك و خاکمان کردوە، شتێکی باشمان کردوە، ئێستاش من لێرەوە ڕێزو تەقدیرو سوپاس دەنێرم بۆ ئەو برا پێشمەرگانەمان، کە لەسنوورەکانی کوردستان ئێمە دەپارێزن، وە ئێمەش ئاوا بە ئارامیی دەتوانین قسەو باسی خۆمان بکەین، بە حەقیقەت جێی هەموو ڕێزو تەقدیرێکن، بەڵام ئایا ئەو پێشمەرگانە هی کێن؟ ئەگەر یەکێتی و پارتی بڵێن: تەنیا هی ئێمەن، واتە: میلیشیان[١]، دەبێ بڵێن: هی هەموو لایەکن و هی هەموو خەڵکەکەن، بەڵێ، لەبەر هەستیاریی، هەندێك لایەنی عەلمانیی، ڕێ نەدرا، کە خەڵکێکی ئیسلامییش بە زەقیی بەشدار بێ، ئێستاش (الحمدلله) زۆرێك لە پێشمەرگەکان نوێژ دەکەن، ڕۆژوو دەگرن، بەڵام ئەگەر ڕێگەدرابایەو دەرفەت ڕەخسابایە، ئێمەش وەك کۆمەڵی ئیسلامیی، کە کاتی خۆی هێزێکی چەکداری باشمان هەبوو، ئێستا ئەگەر ئەوانیش لە نێو ئەو هێزە دابان، بەدڵنیاییەوە جەبهەکەمان بەقوەتتر دەبوو، بە تایبەتی لە بەرانبەر داعشێکدا، کە بە ناوی ئیسلامەوە شەڕ بە ئێمە دەفرۆشێ و گێچەڵ بەم هەرێمە دەکات، وە بە ڕەسمیی چەند جارێك داوامان کرد لە جەنابی کاك مەسعوود بارزانیی، وەك مەکتەبی سیاسی داوامان لەلایەنە سیاسییەکان کرد، کە با ئێمەش ببین، بەڵام بەهەرحاڵ بوار نەدرا، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ گرفتمان نیە، وە ئەوانەی کە لەوێشن برای ئێمەن خوا بیانپارێزێ، ئێمە بە هەمووولایەك دەتوانین ئەم وڵاتەی بەرەو پێش بەرین، وە بیپارێزین، چ لەبەرەکانی جەنگدا، چ لێرە کە دەست بخەینە سەر کەم و کورییەکانی و چارەسەریان بکەین، وە پاکسازیی و چاکسازییەکی وا بکەین، کە جەماوەرەکەمان، خەڵکەکمان زیاتر متمانەدارو باوەڕداربێ بە واقیعە سیاسییەکەمان.

---

(١) واتە: ئەگەر پارتی و یەکیەتی بڵێن: ئەو هێزی پێشمەرگەیە تەنیا هی ئێمەن، مانای وایە بە میلیشیایان لە قەڵەم داون، چونکە هێزی چەکداری سەر بە حیزب، میلیشیایە!

**شازدەیەم[1]: ئایا مامۆستا عەلی باپیر! ئێوە چ جۆرە عەلمانییەتێك ڕەت دەکەنەوە؟**

**وەڵام:** ئەو پرسیارەی جەنابت کە: چ جۆرە عەلمانییەتێك ڕەت دەکەنەوە؟ ڕەتکردنەوە دووجۆرە:

١- ڕەتکردنەوەی نەهێشتن و ڕێ پێنەدان: ئەوە قسەی من نەبوو، بەڵکو قسەی کاك مەلا بەختیار بوو، کە گوایە من گوتوومە: سیکۆلاریزم لە نێو مسوڵماناندا جێی نابێتەوە! من وام نەگوت، گوتم: سیکۆلاریزم لە نێو کۆمەڵگایەکی لەئیسلام تێگەیشتوودا، پاساوی بوونی نیە، چونکە جێی نابێتەوە، یانی: ڕێگای نادەین، ئنجا ئێمە بیستوومانە لە خەڵکی سیکۆلاریست، کە گوتوویانە: دەبێ ئیسلامییەکان سەریان بکوترێتەوە، بەڵام ئیسلامیی نەدەسەڵاتی هەبووە، نەواشیگوتوە، مەبەستم لە هەرێمی کوردستانە، بۆ ئەوەی نەچینەوە بۆ مێژووی ئومەویی و عەبباسیی.

٢- ڕەتکردنەوەی فیکریی و دەرخستنی بێ پاساویی: کە ئەوە مەبەستمانە لەو قسەیە کە: لە نێو میللەتێکی مسوڵماندا کە لە ئیسلام تێگەیشتبێ، پاساوی ڕووکردنە سیکۆلاریزم نیە، چونکە:

**یەکەم:** هەرچی تۆ دەتەوێ لەو شتانەی، کە خەڵکی ئەوروپا بۆ وەدەستهێنانیان، ڕووی کردە سیکۆلاریزم، لە ئیسلامەکەی خۆتدا هەن بە شێوەیەکی باشتر.

**دووەم:** وە هەموو ئەو هۆکارانەی، کە خەڵکی ئەوروپایان ناچار کرد، ڕوو بکاتە سیکۆلاریزم، وە لە چنگ کڵێسا ڕابکات، لە ئیسلامدا بوونیان نیە، تۆ دینەکەت (ئیسلام):

١- کڵێسای تێدانیە.

٢- چینی ئەکلیرۆسی[2] تێدانیە.

---

(١) ئەو پرسیارە هی دکتۆر عادل باخەوان بوو.

(٢) چینی ئەکلیرۆس، یانی: چینی پیاوانی ئایین (رجال الدین)، چونکە بە پێی ڕێنمایی یەکانی کڵێسا، جگە لە پیاوانی کڵێسا: پاپاو قەشەکان، هیچ کەس بۆی نەبوو تەفسیری

٣- ثیۆکڕاسیی تێدانیە.
٤- ڕێی لە عیلم نەگرتوە.
٥- ڕێی لە بیرکردنەوەی عەقڵ نەگرتوە.
٦- ڕێی لە ئازادیی نەگرتوە.
٧- هەموو شتێکی باشی دنیاو قیامەتی تێدایە، بۆیە تۆ ناچار نی ڕوو لەسیکۆلاریزم بکەی.

کەواتە: مەبەست لە قبووڵ نەکردن، ئەوەیە، کە ئێمە دەڵێین: بۆ خەڵکێکی مسوڵمان، ئەگەر لە ئیسلام تێگەیبێ، وە بڕوای بە ئیسلام بێ، ڕوو لە غەیری ئیسلام ناکات، نەك ئێمە ڕێی نادەین، کاتێ خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ ﴾ آل عمران.

ئەمە بۆ دوارۆژە، لە دوارۆژدا هەر کەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، دوای بەرنامەیەکی دیکەی جیا لە ئیسلام بکەوێ، لە دوارۆژدا لێی قبووڵ ناکرێ، ئەدی لە دنیادا؟ بۆ دنیاش خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكافرون.

چونکە عەلمانییەت من بە دینی دەزانم، چ بەبارە، ئیلحادییەکەی دا، چ بەبارەکەی دیکەدا، ئەوە کە خواناس بێ، وە تەنانەت بڕوای بە بەشێك لەئیسلامیش هەبێ، بە هەردووك جۆرەکەیەوە، من بەدینی دەزانم، عەلمانییەتیش دینێکی مرۆڤییە، مرۆڤ دروستی کردوە، بەڵام خوای زاناو توانا بە من دەفەرموێ، بڵێ:

﴿ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكافرون.

---

کتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) بکات! کە لە ئیسلامدا شتی وانیە.

واتە: ئایینی خۆتان بۆ خۆتان، وە ئایینی خۆم بۆ خۆم.

وە دەفەرموێ: ﴿ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ ﴿٢٩﴾ ﴾ الكهف.

واتە: وە بڵێ: هەق لە پەروەردگارتانەوەیە، ئنجا كێ دەیەوێ با بڕوابێنێ و، كێش دەیەوێ با بێبڕوابێ.

ئنجا ئەوەی من دەمەوێ ئێمە بزانین، ئەوەیە كە عەلمانییەتیش جۆرێكە لەدین، تۆ خۆت بە مسوڵمان بزانی، ناتوانی عەلمانیی بێ[1]، بڵێ: مسوڵمان نیم و تەواو، ئیدی ئاشكرایە، كە لەم وڵاتەی ئێمەدا، ئێستاش چەندان كەمینەی نامسوڵمان هەن، وە لە مێژووی سێزدە سەدەیی دەوڵەتی ئیسلامیشدا، بووزایی هەبووە، جوولەكە هەبووە، مەسیحیی هەبووە، هیندۆسیی هەبووە، مەجووسیی هەبووە، تەنانەت زانایانی ئیسلام و سەركردەكانی ئیسلام گوتوویانە: نابێ ئاگری مەجووسییەكان بكوژێننەوە! پرسیاریان لە عومەری كوڕی خەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) كرد، گوتیان: ئەوانە نیكاحی مەحاریم دەكەن، واتە: دایك و كچ و خوشكی خۆیان مارە دەكەن، گوتی: (دعهم وما یدینون) لێیان گەڕێن، مادام دینیان وایە، موعتەقەداتیان وایە، حەقتان بەسەریانەوە نەبێ.

كەواتە: وەك هەبوونی پاساوو بیانووی پەنا پێبردن و شوێنكەتن، هیچ جۆرێك لە عەلمانییەتمان قبووڵ نیە، بەڵام وەك ڕێ پێدان و مامەڵەی ڕۆژانە، ئەوەنیە كە یەكدیمان قبووڵ كردوە! لە ڕاستیدا ئێمە گلەییمان لە سیكۆلاریستەكانە، كە غەیری خۆیان ئەگەر بە تیۆریی (نظري)یش قبووڵ بكەن، بە كردەوە قبووڵیان ناكەن، بە بەڵگەی چی؟ بە بەڵگەی ئەوە، كە خۆیان بە خاوەنی هەموو

---

(١) واتە: بە ماناو چەمكی ڕاستەقینەی عەلمانیی (سیكۆلاریست)، نەك جۆرە ماناو چەمكێك كە خۆمان بۆی دادەتاشین، یان بە لاسایی كردنەوەی ڕۆژئاواییەكان وەریدەگرین، كە بێگومان ئێمەو ئەوان وەك مێژوو، وەك ئایین، وەك كتێب .. زۆر لە یەك جیاین، وەك پێشتر باسمان كرد.

شتەکانی وڵات دەزانن، وە خەڵکی دیکەیان لێ مەحرووم دەکەن، وە ئێمە وەك ئیسلامیی، خۆمان بە بەشخوراو دەزانین، نەك هەر لەم هەرێمەدا، لە زۆر شوێنی دیکەشدا، ئەوە ئێمەین دەڵێین: وەرن بایەکدی قبووڵ بکەین، دەڵێین: وەك چۆن ئێمە ئێوەمان قبووڵە، خۆ ماڵ لە ماڵ خۆ حەرام نیە، وڵاتێکی مسوڵمان نشین، ناگونجێ لە خەڵکەکەی خۆی قەدەغە بکرێ! تۆ هاتووی ئایینێکی دیکەت داهێناوە، ئنجا من تۆم قبووڵە، بەو دینەشتانەوە، چونکە دینەکەم وا فەرمانم پێدەکات، ئێوەش ئێمەتان قبووڵ بێ، بەڵام ئێمەتان قبووڵ بێ، وەك مرۆڤ، وەك هاووڵاتیی یەکسان، نەك وەك هاووڵاتیی پلە سێ و چوار، وە نەك وەك ئەوە، کە لە مافە ڕەوایەکانی خۆم بەخێر شتێکم بدەیە، لە بەرانبەر ئەوەدا، کە تۆ چیت ویست وا بکەم!!

**حەڤدەیەم: بە نسبەت ئەوەوە کە پرۆفیسۆر میشێل، گوتی:** من پێی دەڵێم: شتێکی سەیرە! دیموکراسی کە لە مێژووی هاوچەرخماندا بۆ یەکەمجار لە ئەورووپادا، لە فەڕەنساوە داکەوت و پراکتیزە بوو، پاش شۆڕشی فەڕەنسا (١٧٨٩)، پێم سەیرە دوای دوو سێ سەدە، ئێستاش لە فەڕەنسا، لە نێو دیموکراسییەکەی داو لە نێو عەلمانییەتەکەی دا، جێی دوو سێ ئافرەتی سەرپۆشی لێ نەبێتەوە! ئەمە نوقصانییەکی گەورەیە بۆ فەڕەنسا، حەیفە جێی دوو سێ ئافرەتی بە سەرپۆشی تێدا نەبێتەوە، کە سەرپۆشەکەیان تەعبیر دەکات لە بیرو موعتەقەداتی خۆیان، ئەدی ئێوە ناڵێن ئازادیی بیروڕا، ناڵێن: ئازادیی شەخصیی، ئەو ئافرەتەش شەخصێکە ئەو پێیخۆشە قژی داپۆشێ، بۆچی دەبێ جێی نەبێتەوە؟ پێم وایە دەبێ زۆر بەجیددیی موراجەعەی ئەوە بکەنەوە.

## پێنج دەقەی کۆتایی

**هەژدەیەم: لەم پێنج دەقەیەدا بە پێویستی دەزانم باسی ئەوە بکەم، کە بۆچی لەبارەی مێژووی سیکۆلاریزم و دیموکڕاسییەوە گەڕامەوە بۆ مێژووی ئەورووپا؟! کە کاك مەلا بەختیار چەند جارێك ئاماژەی پێدا، کە من بۆچی ئەوەم باس کرد؟**

**وەڵام:** ئێمە باسی سیکۆلاریزم و دیموکڕاسی دەکەین، دیموکڕاسی و سیکۆلاریزمیش لە ئەورووپاوە هاتوون، کەواتە: ناچارم باسی مێژووی ئەوێ بکەم، کە ئەو سیکۆلاریزمە چۆن پەیدابوو؟ وە ئەو دیموکڕاسییە چۆن پیادەکرا؟ وە هەرێمی کوردستان بەراورد بکەین، کە ئێمە لێرەدا چیمان کردوەو چۆنمان کردوە؟

وە دەمەوێ ئەوە ڕوون بکەمەوە، کە بۆچی ئایینی مەسیحیی کە تێکدراوەو شێوێنراوە لەسەر دەستی کڵێسا، "نەك ئەوەی کە خوا بۆ عیسای ناردوە (علیه السلام)" ناتوانێ ژیانی بەشەر لەم ڕۆژگارەدا ڕێك بخات؟! جارێ مەسیح، عیسا (علیه السلام) بۆ قۆناغێکی مێژوویی و تەنیا هۆزێك هاتبوو، کە بەنی ئیسرائیلە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَىَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ...﴿٦﴾﴾ الصف.

کەواتە: عیسا تەنیا بۆ بەنی ئیسرائیل هاتوە، واتە: شتێکی ئاسایی و چاوەڕوانکراوە کە: ئایینەکەی عیسا نەتوانێ لە سەدەی بیست و بیست و یەکداو، پێشتریش ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگا ڕێك بخات، مەسیحییەتێك

شەریعەتێکی نەبێ، بەڕێوەی بەرێ، خەڵك ناچارە پەنا بۆ شتێکی دی بەرێ، بە تایبەت دوای ئەوەی، کە ئیسلام هات، کاتێ خوای بەرزو مەزن، کە ئیسلام دەنێرێ، بۆ ئەوەی دەنێرێ، هەموو بەشەرییەت پێی بەڕێوەبچێ، هەروەك کە لە ماوەی سێزدە سەدەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا، بەشەریەتی پێ بەڕێوە چووە، لەگەڵ ئەوەش کە کەم و کوڕیی و لادانیش بووە، ئنجا ئەوەی کە ئیشکالە لێرەدا ئەوەیە، کە وەختێك لە ئیسلامدا دین و دەوڵەت لێك جیا دەکرێتەوە، ئەوە زوڵم لەئیسلام دەکەی، چونکە ئیسلام شەریعەتی هەیە، بەڵام ئایینی مەسیحیی چوار ئینجیلەکانی بخوێنەوە، هەمووی ئامۆژگاریی ڕووحیی و باسی پەیوەندییە لەنێوان خواو مرۆڤدا، بەڵام باسی حەڵاڵ و حەرام و جەنگ و ئاشتیی و، حوکم و سیاسەت و، ئابووریی و، باسی پەیوەندیی نێوان دەوڵەتان و .. هتدی، تێدانیە.

**نۆزدەیەم: کاك مەلا بەختیار بە توانجەوە، ئاماژەی بە ئایەتی:**

**﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ ...﴿٦٠﴾﴾ الأنفال، کرد، کە ئیسلام باسی ئامادەکردنی هێزی کردووەو فەرمانی بە جەنگ و جیهاد کردووە!!**

**وەڵام:** ئایا هەر قەوارەیەکی سیاسیی، وەك: فەڕەنساو ئەمریکاو ئەوانەی دیکە کە مافی ڤیتۆیان هەیە، لە ئەنجوومەنی ئاسایش (مجلس الأمن)دا[1]، وە هەموو ئەوانەی کە چەکی ئەتۆمییان هەیە، هێزو سوپاو چەك و جبەخانەیان هەیە، کاك مەلا بەختیار! ئەدی نابێ دەوڵەتان چەکیان هەبێ، دیفاعی پێ لەخۆیان بکەن؟ بۆیە دەوڵەتێکی ئیسلامیی، کە خوا لەسەری فەرز دەکات، کە دەبێ هێزێکتان هەبێ، تاکو دوژمنانی خۆتانی پێ بترسێنن، بۆ ئەوەی کەس زوڵمتان لێ نەکات، ئەمە شتێکی زۆر ئاساییە، کۆمەڵگای بەشەریی هەروایە.

---

(١) ئەو پێنج دەوڵەتەی مافی ڤیتۆ (veto) یان هەیە لە ئەنجوومەنی ئاسایش دا، ئەم پێنجەن: ئەمریکا، چین، ڕووسیا، بەریتانیا، فەڕەنسا.

دیارە هەبوونی ئەو مافەش بۆ ئەو پێنج دەوڵەتە ستەمێکی گەورەی سیاسییە بەرانبەر بە دەوڵەتانی دیکەی جیهان.

تۆ ئەگەر هێزت نەبێ، ستەمت لێ دەكرێ و دەخورێی! بۆ وێنە: گەلی كورد ئەگەر هێزی نەبێ، پێشمەرگەكانمان، ئەگەر ئێستا بەرگریی لەم قەوارەیە نەكەن، داعش و ماعش دەمانخۆن!

**بیستەم: كاك مەلا بەختیار بە مەبەستی بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕەوایی لە یەك جیاكردنەوەی ئایین و دەوڵەت ئایەتێكی ئینجیلی هێنایەوە، بەڵام ئایەتەكەی ئینجیلیشی بە هەڵە هێنایەوەو، بەڵگەكەشی لە جێی خۆیدا نیە.**

ئایەتەكەی ئینجیل بەم شێوەیە: (أعطوا ما للقيصر للقيصر، وما لله لله)[١]، بۆیەش قسەكەی بە بەڵگە ناشێ، چونكە مەسیحییەت هاتبوو، كەم و كوڕییەكانی جوولەكەكان ڕاست بكاتەوە، وە بۆ قۆناغێكی مێژوویی دیارییكراو، وە بۆ هۆزێكی دیارییكراو هاتبوو، بەڵام ئیسلامێك بە پانایی زەمان و بە درێژایی زەمین، بۆ هەموو مرۆڤایەتیی هاتبێ، وەك خوای تاك و پاك دەفەرموێ:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ سبأ[٢].

ئەم ئیسلامە لە بارەی دا هەیە، كە هەموو بەشەریەت هیدایەت بدات، وە ژیانی لەسەر ئاستی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتیی، ڕێك بخات، بۆیە ئەو ئیسلامە تۆ زوڵمی لێ دەكەی، كاتێ لایەنی وحوكمڕانیی لێ جیا دەكەیەوە، چونكە شەریعەتەكەی پەك دەخەی، بەڵام مەسیحییەت بۆ خۆی شەریعەتێكی نیە، تاكو پەك بخرێ، بۆیە ئەگەر لە دەوڵەتیشی جیا بكەیتەوە، شتێكی ئاساییە.

---

(١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل لوقا، الإصحاح: ٢٠، ص٢١٤٣، دفع الجزية للقيصر، واتە: ئەوەی هی قەیسەرە بیدەنە قەیسەرو، هی خواش بدەنە خوا.

(٢) واتە: وە تۆمان وەك موژدەدەرو ترسێنەر بۆ تێكڕای خەڵكی ناردوە، بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

# بەشی پێنجەم

## وەڵامی چەند قسەیەك کە لە دیبەیتەکەدا فریای وەڵامدانەوەیان نەکەوتم

**خوێنەری بەڕێز!**

بە پێویستی دەزانم، ئەگەر زۆر بە کورتیش بێ، وەڵامی چەند قسەیەك بدەمەوە " کە لەبەر کەمیی کات" لە دیبەیتەکەدا دەرفەتی وەڵامدانەوەو قسە لەسەر کردنیانم نەبوو.

**کۆی ئەو قسانەش (١١)ن، حەوتیان هی کاك مەلا بەختیارن و چواریشیان هی (میشێل ڤیڤیۆرکا)ن:**

## یەکەم: چەند قسەیەکی کاك مەلا بەختیار:

**١- ئەوەی (صلاح الدین) کردی بەرانبەر بە فاتمییەکان:**

کاك مەلا بەختیار لە سیاقی ڕەخنەگرتنی لە مێژووی ئیسلام مسوڵماناندا، باسی ئەوەی کرد، کە گوایە (صلاح الدین)ی ئەییوبیی، ستەمی لە فاتمییەکان کردوە، کە کۆتایی بە حوکمڕانییەکەیان هێناوە!

**وەڵام:**

ڕاستە (صلاح الدین) خوا لێی خۆشبێ، کۆتایی بە حوکمڕانیی (فاطمیة)کان هێناوە، بەڵام نەك هەر کارێکی خراپی نەکردوەو ستەمی لێیان نەکردوە، بەڵکو ئەو کارەی یەکێك بووە لە کارە هەرە باشەکانی (صلاح الدین)، وە کۆتایی هێنان بووە، بە ستەمێکی (٢٠٨) ساڵەیی فاتمییەکان، کە بە زۆر خۆ سەپاندن، لە ساڵی: (٣٥٩)ی کۆچییەوە، تاکو (٥٦٧) حوکمی (مصر) و بەشێك لە ناوچەکانی دەوروبەرییان کردوە[1].

---

(١) بڕوانە: (البداية والنهاية) لآبن كثير ج١٤، ص٢٠٨.

شایانی باسیشه که یه‌که‌مین حوکمڕانیی فاتیمییه‌کان، نازناوی (مهدي) هه‌بووه‌و ناوی: (عبيدالله بن ميمون القدَّاح) بووه، که جووله‌که بووه‌و، لافی مسوڵمان بوونی لێداوه‌و، پیشه‌ی بۆیاغچێتیی بووه، له (سلمية)[1].

وه (ابن كثير) نووسیویه‌تی و (ابن الأثير) باسی ئه‌وه‌ی کردوه، که (مهدي) نامه‌ی ناردوه بۆ (أبو ظاهر القرمطي) و سه‌ر زه‌نشتی کردوه له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی، که له مه‌ککه کردوویه‌تی " که کابه‌ی ڕووخاندوه‌و به‌رده ڕه‌شه (الحجر الأسود)ی بردوه" وه گوتوویه‌تی: ئه‌و ڕه‌فتاره‌ی ئێوه هۆکاری ئه‌وه‌یه، که خه‌ڵك قسه‌مان له‌سه‌ر بکات و، ئه‌و نهێنییانه‌مان، که په‌نهانمان کردوون، به هۆی ئه‌و ڕه‌فتاره ناشیرینه‌ی ئێوه‌وه ئاشکرا بین[2].

که‌واته: (قرامطة) و (فاطمية) له ڕیشه‌دا یه‌ك بوون و که‌ین و به‌ینیان پێکه‌وه بووه.

ئنجا دوا حوکمڕانی (فاطمية)، که به (العُبَيديين)یش ناسراون، ناوی (عبدالله) و نازناوی (عاضد) بووه‌و (إبن كثير) ئاوای باس ده‌کات: (وكانت سيرته مذمومة، وكان شيعياً خبيثاً، لو أمكنه قَتَلَ كُلَّ مَنْ قَدَرَ عَلَيْهِ مِنْ أَهْلِ السنة)[3]. واته: وه هه‌ڵس و که‌وتی زۆر بێزراو بوو، وه شیعه‌یه‌کی پیس بوو، ئه‌گه‌ر بۆی لوا بایه، هه‌رچی به‌ر په‌لی که‌وتبایه له ئه‌هلی سوننه‌ت، ده‌یکوشت.

**٢- کوشتنی (قرامطة) له‌لایه‌ن ده‌وڵه‌تی ئیسلامییه‌وه:**

هه‌ر له‌و سیاقه‌دا، که گوایه مسوڵمانان خوێنڕێژیی و سته‌میان کردوه، کاك مه‌لا به‌ختیار باسی ئه‌وه‌ی کرد، که مسوڵمان (قرامطة)شیان کوشتوون!

---

(١) هه‌مان سه‌رچاوه ج١٢، ص٨٣.

(٢) بڕوانه: (البداية والنهاية) لابن كثير ج١٢، ص٨٤، وه (الكامل في التأريخ) لابن الأثير ج٨، ص٢٠٨.

(٣) بڕوانه: (البداية والنهاية) لابن كثير ج١٤، ص٢٠٨.

وەڵام:

وا دیارە کاك مەلا بەختیار زانیاریی لە بارەی گرووپی قەرامیتەکان (قرامطة)ەوە نیە، چونکە لە نێو گرووپە لادەرەکاندا، هیچ گرووپێك هێندەی (قرامطة) ستەم و خراپەو کاری ناقولاَیان نەکردوە، وێڕای کوفرو زەندەقەی ئاشکرا، با سەرنج بدەین:

(إبن کثیر) لە ڕووداوەکانی ساڵی (٣١٧)ی کۆچیی دا، لە ژێر ناوونیشانی: (ذكر أخذ القرامطة الحجر الأسود إلى بلادهم، وما كان منهم إلى الحجيج، لعن الله القرامطة)[1]دا گوتوویەتی:

{کاروانی عیراق، کە فەرماندەیان (منصور الدَّيلمي) بوو، دەرچوون و بەسەلامەتیی گەیشتنە مەککە، وە لە هەموو لایەکەوە کاروانەکان گەیشتن، ئیدی لە ناکاو (قرمطي) (واتە: أبو ظاهر) لە ڕۆژی (تروية)دا (واتە: ڕۆژی "٨"ی "ذي الحجة") خۆی و کۆمەڵەکەی بە سەریان دا دان و، ماڵ و سامانیانی لێ ستاندن و کوشتنیانی ڕەوا کرد، وە خەڵکی لە نێو مەککەو دۆڵ و شێوەکانی داو، تەنانەت لە مزگەوتی حەڕام و لە نێو کابەش دا، کوشت...

ئیدی خەڵك لە دەستیان ڕایان دەکردو، خۆیان بە پەردەکانی کابەوە هەڵدەواسی، بەڵام سوودی نەبوو، بەڵکو بەو حاڵەشەوە، هەر دەیانکوشتن، وە لە کاتی تەواف کردن دا دەیانکوشتن...

پاشان قیرمیطیی فەرمانی کرد: کە کوژراوەکان فڕێ بدرێنە نێو بیری زەخرەمەوە، ئنجا فەرمانی کرد، دەرگای کابە هەڵکەنراو، پەردەکەی داڕنراو، لە نێو هاوەڵانی دا دابەشکرد...

دوایی فەرمانی کرد: بەردە ڕەشەکەیان هەڵکەندو لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ

---

(١) واتە: با بەردە ڕەشە بردنی قەرمەتییەکان، بۆ وڵاتی خۆیان و ئەوەی کە کردیان بەحاجییان، خوا نەفرین لە قەرامەتییەکان بکات.

وڵاتی خۆیان، وە ماوەی بیست و دوو (٢٢) ساڵ لەلایەن مایەوە، تاکو لە ساڵی (٣٣٩)دا، گێڕایانەوە (٣١٧ - ٣٣٩)[1]}

دوایی (إبن کثیر) لەبارەی (قرامطة)وە، دەڵێ: (وإنما حمل هؤلاء على هذا الصَّنيع، أنهم كانوا كفاراً زنادقة، وقد كانوا ممالئين للفاطميين الذين نبغوا في هذه السنة، ببلاد إفريقية، من أرض المغرب) [2]، واتە: وە ئەوانە بۆیە ئەوەیان کرد، چونکە کافرو زەندیق بوون، وە سەر بە فاتیمییەکان بوون، کە لەم ساڵانەدا لەوڵاتانی ئەفریقیا لەسەر زەمینی (مغرب) پەیدابوون.

هەروەها (إبن کثیر) لە بارەی ڕووداوەکانی ساڵی (٢٩٤)ی کۆچییەوە، گوتوویەتی:

{وە لە موحەڕڕەمی ئەمساڵ دا "زکرویە" و هاوەڵانەکانی (خوا نەفرینیی لێ بکات)، ڕێیان بەحاجییەکانی خوراسان گرت، لەکاتی گەڕانەوەیاندا لەمەککە، وە هەموویانی کوشتن و ئافرەتەکانیشیانی بە کۆیلە گرت، وە ئەو پارەیەی لێی گرتن: دوو هەزار هەزار (٢،٠٠٠،٠٠٠) دینار بوو، وە ژمارەی کوژراوەکانیش: بیست هەزار (٢٠،٠٠٠) کەس بوون)}[3]

هەڵبەتە کەتن و تاوان و خراپەی قەرمەطییەکان، زۆر لەوە زیاترە، وە ئەوەی، کە باسمان کرد، تەنیا وەك چەند نموونەیەك باسمان کرد.

کەواتە: ئایا شتێکی سەیرو بێ جێ نیە، گلەیی لە مسوڵمانان بکرێ، کە دواتر سزای ئەو گرووپە زەندیق و بێ دینەیان دابێ؟!

**٣- ئیسلام بە شمشێر بڵاوبۆتەوە، خۆ خەڵك بە هەڵەکەسەما، بۆی نەچوون:**

ئەمیش یەکی دیکە بوو لە قسەکانی کاك مەلا بەختیار، کە چەند جارێك دووبارەی کردەوەو، زۆری لەسەر ڕۆیشت.

---

(١) بڕوانە: (البداية والنهاية) لابن كثير ج١٢، ص٨٢، ٨٣.

(٢) هەمان سەرچاوە ص٨٣.

(٣) هەمان سەرچاوە، ج١١، ص٣٨٧، هەروەها بڕوانە: (الكامل في التأريخ) ج٦، ص٤٣٢ و ٤٣٣.

وه‌ڵام:

**یه‌كه‌م:** وه‌ك مه‌بده‌ئو پرەنسیپ، ناگونجێ ئیسلام به‌ زۆر به‌سه‌ر خه‌ڵكدا بسه‌پێنرێ، چونكه‌ خوای دادگه‌ر ڕایگه‌یاندوه‌، كه‌ تۆبزیی كردن (إكراه) له‌ئاییندا نیه‌، وه‌ك فه‌رموویه‌تی:

﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ ﴾ البقرة.

**دووه‌م:** وه‌ك پراكتیك و كرده‌وه‌ش، هه‌میشه‌ سوپای مسوڵمانان، به‌رانبه‌ره‌كانیان خستۆته‌ نێوان سێ بژارده‌وه‌:[1]

١- مسوڵمان بوون.

٢- سه‌رانه‌ دان، یان هه‌ر جۆرێكی دیكه‌ی ڕێككه‌وتن، كه‌ ده‌وڵه‌تی ئیسلامیی قه‌ناعه‌ت بكات، ئه‌و خه‌ڵكه‌ دژایه‌تیی ناكه‌ن.

٣- ئاماده‌ بوون بۆ جه‌نگ.

**سێیه‌م:** ئه‌گه‌ر ڕاستبایه‌ ئیسلام به‌ زۆر به‌سه‌ر گه‌لی كورد "هه‌روه‌ها گه‌لانی دیكه‌ش"دا سه‌پێنرابایه‌، ده‌بوایه‌ له‌ مێژبایه‌ گه‌لی كورد ده‌ستبه‌رداری ئیسلام ببوایه‌، چونكه‌ هه‌ر شتێك به‌ زۆر بسه‌پێنرێ، پاش لاچوونی زۆرو ده‌سته‌ڵاته‌كه‌، فڕێ ده‌درێ و وازی لێ ده‌هێنرێ!

كه‌واته‌:

گوته‌ی: به‌ زۆر سه‌پێنرانی ئیسلام، به‌سه‌ر گه‌لی كورددا، دژه‌ له‌گه‌ڵ هه‌ر كام له‌:

أ- سروشتی ئیسلام.

ب- مێژووی مسوڵمانان.

---

(١) بروانه‌: تأريخ الأمم والملوك، للطبري، ج٢، ص١٠٧ و ١٠٨، كه‌ (ربعي بن عامر) وه‌ك نوێنه‌ری سوپای ئیسلام به‌ (رستم) فه‌رمانده‌ی سوپای فارسه‌كانی گوتوه‌: (واختر واحدة من ثلاث: اختر الإسلام، وندعك وأرضك، أو الجزاء، أو المنابذة) واته‌: یه‌كێك له‌ سێ شتان هه‌ڵبژێره‌: مسوڵمان بوون هه‌ڵبژێره‌و خۆت و وڵاتی خۆت، یان سه‌رانه‌ بده‌، یان ئاماده‌ی جه‌نگ به‌.

ج- عەقڵ و لۆژیك، دا[١].

**٤- من جیهانبینیم جیایە، هی تۆ له ڕوانگەی ئیسلامەوه، هی من له ڕوانگەی سیكۆلاریزمەوه:**

**وەڵام:**

تێبینیم لەسەر ئەم قسەیەی كاك مەلا بەختیار، ئەوەیە، كه مادام خۆی بەمسوڵمان دادەنێ، پێویستە جیهانبینی و بوونناسیی (Ontology)یەكەیشی هەر له ئیسلام وەربگرێ، نەك له سیكۆلاریزم، چونكه بوونناسیی و دنیابینیی، بناغەی بیروبڕواو سەرجەم هەڵس وكەوت و هەڵوێستەكانی مرۆڤه و، هەر كەس بەو شێوەیە بوون (وجود) ببینێ، كه ئیسلام دەیڵێ، دیارە بەو شێوەیەش مامەڵە لەگەڵ ژین و بووندا دەكات، كه ئەو تێڕوانینە دەیخاتەڕوو، هەروەها بەپێچەوانەوەش! هەر بۆیەش خۆ به مسوڵمان زانین و، پەنا بردنە بەر جیهانبینیی سیكۆلاریزم، ناكۆكیی (تضادّ)یەكی توندیان له نێواندا هەیە[٢].

**٥- هەموو لایەك له مۆدێرنێتە بەهرەمەندین، ئەوە دەستكەوتی عەقڵە، نەك نوشتەو غەیبیات:**

**وەڵام:**

بەهرەمەندبوونی هەموو لایەك له تازەگەریی (الحداثة) (Modernita) شتێكی مشت و مڕ هەڵنەگرە، بەڵام گرنگە بزانرێ، كه ئەم مۆدێرنێتە، بەرهەم و زادەی كۆی ئەزموون و شارەزاییە كەڵەكەبووەكانی مرۆڤایەتییەو، هی هیچ گەل و كۆمەڵگایەك نیە به تەنیا، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێكردوە.

---

(١) وا باشە لەم بارەوە سەرنجی ئەم دوو كتێبە بدرێ:
١- كوردستان لەبەردەم فتوحاتی ئیسلامیی دا، نوسینی: حەسەن مەحمود حەمە كەریم.
٢- كورد لەنێوان بەئیسلام كردن و ئیسلام بون دا، نوسینی: سەلام ناوخۆش.

(٢) له كتێبی (تەوژمیی ئیسلامیی و عەلمانیی...)دا تیشكێكم خستۆتە سەر بوونناسیی ئیسلامیی، بەڵام لێكۆڵینەوەی تێروتەسەلی ئەو بابەتە، كتێبی یەكەمی مەوسووعەی: (الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله)ی بۆ تەرخان كراوە.

ئنجا ئەوەش کە تازەگەریی و تەکنۆلۆژیا بەرهەمی عەقڵە، نەك هی نوشتەو غەیبییات! ئێمەش نکوولیی لەوە ناکەین، کە بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ و دۆزینەوەی یاساکانی خوا (سنن الله) لە بوونەوەرو سروشت دا، بێگومان ژیانی بەشەر بەرەو پێش ناچێ، بەڵام نەمزانی: ناوبراو بەو قسەیەی وەڵامی کێ دەداتەوە؟!

چونکە ئەوە ئیسلام بوو، عەقڵ و هۆشی مرۆڤانی لە زنجیرو کۆتی ئەفسانەو کەهانە، دەرباز کردو، لەسەر عەقڵی فەرز کرد، کە دەبێ بیر بکاتەوەو، سەرنج بداتە دیاردەو دیمەنەکانی دەوروبەرو بوونەوەرو لە ئایەتەکانی خوا بفکرێ:

- ﴿ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦ ﴾ الأعراف.

واتە: بەسەرهاتان بگێرەوە، بەڵکو بیربکەنەوە.

- ﴿ أَوَلَمۡ يَنظُرُواْ فِي مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ ١٨٥ ﴾ الأعراف.

واتە: ئایا سەرنجی موڵکی فراوانی ئاسمانەکان و زەوی و هەرشتێکیان نەداوە، کە خوا دروستی کردوە!

- ﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ٢٤٢ ﴾ البقرة.

واتە: ئاوا بەم جۆرە خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕون دەکاتەوە، بەڵکو بفامن.

مەسەلەی نادیار "غیب"یش وێڕای ئەوەی، کە بناغەی ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی بڕواهێنانە بە نادیار:

﴿ الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣ ﴾ البقرة.

ئێستاکە پاش بەرەو پێشچوون و قووڵبوونەوەی زانستەکانی فیزیاو کیمیاو گەردیلەناسیی، بۆ هەموو لایەك دەرکەوتوە، کە زانیاریی، هەتا بنان گوێیان، لەنادیارو پەنهاندا چەقیوە!

**٦- بۆچی دیموكراسی دانه‌مه‌زرا له‌ ئیسلام دا؟!**

**وه‌ڵام:**

به‌ دڵنیاییه‌وه‌، ئیسلام به‌ هۆی حوكمڕانیی ڕه‌شیدو سه‌ر ڕاستانه‌ی پێغه‌مبه‌ری خاته‌م و، چوار جێنشینه‌ سه‌ر ڕاسته‌كانییه‌وه‌، (خوا لێیان ڕازی بێ)، كه‌ فه‌رمانی خوا: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ ﴿٣٨﴾﴾الشورى، یان كردبوو به‌ بناغه‌ی كاری سیاسیی و ده‌وڵه‌تداریی، به‌ردی بناغه‌ی: (خه‌ڵك سه‌رچاوه‌ی ده‌سته‌ڵات بوون)ی دانا، به‌ڵام به‌ داخه‌وه‌ كۆمه‌ڵگاكانی ئه‌وساكه‌، نه‌یانتوانی بچنه‌ ئه‌و ئاسته‌ بڵنده‌و، ئه‌و جۆره‌ حوكمڕانییه‌، ته‌نیا ده‌وری چل (٤٠) ساڵێك ده‌وامی كرد، له‌ بواری شێوازی دانانی حوكمڕاندا.

واته‌: خه‌تای ئیسلام نه‌بوو، كه‌ شێوازی حوكم و ده‌سته‌ڵات به‌ ده‌ست خه‌ڵك و جه‌ماوه‌ره‌وه‌ بوون، به‌رده‌وام نه‌بوو، به‌ڵكو ئه‌وه‌ دواكه‌وتوویتیی مرۆڤ بوو، كه‌ نه‌یتوانی بچێته‌ ئه‌و ئاسته‌ به‌رزه‌وه‌و له‌سه‌ری به‌رده‌وام بێ.

ئنجا هه‌ڵبه‌ته‌ خه‌ڵكی ڕۆژئاواش، چه‌ندان سه‌ده‌و سه‌دان ساڵ، تالاوی ئه‌زموونه‌ تاڵه‌كانی: (ثیۆكراسیی theocracy) و (ئه‌ریستۆكراسیی Aristocracy) و (ئۆتۆكراسیی Otocracy) چێشت، تاكو سه‌ره‌نجام گه‌یشتنه‌ ئه‌و قه‌ناعه‌ته‌ی، كه‌ شێوه‌ حوكمڕانیی دیموكراسیی ته‌به‌نیی بكه‌ن.

**٧- تۆ بچیه‌وه‌ بۆ مێژوو، منیش ده‌چمه‌وه‌ بۆ مێژوو!**

**وه‌ڵام:**

گه‌ڕانه‌وه‌ی من بۆ مێژووی ڕۆژئاواو ئه‌وروپا به‌ تایبه‌ت، په‌یوه‌ست بوو به‌نێوه‌رۆك و جه‌وهه‌ری بابه‌ته‌كه‌مانه‌وه‌: (سیكۆلاریزم و دیموكراسیی)، كه‌ له‌ڕۆژئاواوه‌ سه‌ریان هه‌ڵدا، بۆیه‌ پێویست بوو، سه‌رنجی مێژووی سه‌رهه‌ڵدان و هۆكاره‌كانی په‌نا پێبرانیان بده‌ین له‌ مێژووی ئه‌ورووپاو ڕۆژئاوادا، به‌ڵام پێم ناڵێی: گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ مێژووی ئومه‌ویی و عه‌بباسیی و فاتیمیی و .. هتد، چ په‌یوه‌ندییه‌كی به‌ بابه‌ته‌كه‌ی ئێمه‌وه‌ هه‌بوو؟!

## دووەم: چەند قسەیەکی میشێل ڤیڤیۆرکا:

بەڕێز پرۆفیسۆر ڤیڤیۆرکاش چەند قسەیەکی کردن، بە پێویستی دەزانم سەرو تیشکیان بخەمە سەر:

**١- ئێوە چۆن پرۆسەی خوێندن پێش دەخەن؟!**

**وەڵام:**

پێم وایە پرۆسەی خوێندن لە هەرێمی کوردستاندا، بە چەند شتێك بەرەو پێش دەچێ:

**یەك:** هەر لە باخچەی ساوایانەوە، تاکو زانکۆیەکان و خوێندنی باڵاش دەست تێوەردانی حیزبییان لێ دوور بخرێتەوە، وازیان لێ بهێنرێ، پیشەییانە کاری خۆیان بکەن.

**دوو:** سوود لە ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوو وەربگیرێ، بەڵام نەك تەنیا بەدروشم و خۆ هەڵکێشان، بەڵکو بە کردەوەو جێبەجێ کردن.

**سێ:** گەڕانەوە بۆ سەر ڕەسەنایەتیی خۆمان، لە هەموو بوارەکاندا: جیهانبینیی، عەقیدەیی و، فیکریی، ڕەوشت و ئاکار، وە واز لە لاسایی کردنەوەی ئەم و ئەو هێنان.

**چوار:** سازاندن و ڕەخساندنی کەش و هەوایەك، کە قوتابیی و خوێندکاران، تێیدا تەنیا سەرگەرمی وەدەستهێنانی زانست و شارەزایی زیاترو، خۆ پێگەیاندن بن و، بە شتی لاوەکییەوە سەرگەرم نەکرێن.

**پێنج:** لە بەرنامەی خوێندن دا، بە تایبەت لە قۆناغەکانی ساوایان و سەرەتایی و نێوەندیی و ئامادەیی دا، وێڕای فێرکردن (تعليم) گرنگییەکی شایستە بەپەروەردەکردن (تربية)یش بدرێ، بەڵام پەروەردەیەکی گشتگیرو هاوسەنگ، کە هیچ لایەنێکی کەسایەتیی مرۆڤ پشتگوێ نەخات.

٢- سیكۆلاریزم و دیموكڕاسی، دوو شتی پێكەوە پەیوەستن و بەبێ یەكدی نایانكرێ.

مەبەستی ئەوە بوو، كە هەر كەس بیەوێ دیموكڕاسیی پیادە بكات، پێویستە پێش ئەوە ببێتە سیكۆلار!

ئەم قسەیەی لەو چاوپێكەوتنەدا كرد، كە كەناڵی ڕووداو دوای دیبەیتەكە، لەگەڵیدا ئەنجامیدا.

وەڵام:

دەتوانم زۆر بەڵگان بێنمەوە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی، ئەو قسەیەی بەڕێز ڤیڤیۆركاو ئیسپات كردنی پێچەوانەكەی، واتە: هەبوونی سیكرلاریزم بەبێ دیموكڕاسیی و، هەبوونی دیموكڕاسییش بەبێ سیكۆلاریزم:

**یەك:** هەر كام لە هیتلەری ئەڵمانیی و، مۆسۆلینی ئیتاڵیی و، ستالینی یەكیەتی سۆڤیەت و (جمال عبد الناصر)ی میسریی و .. هتد، سیكۆلاری سەر سەخت بوون و، دیكتاتۆری بێ ڕەزاش بوون.

كەواتە: كوا پێكەوە پەیوەست بوونی سیكۆلاریزم و دیموكڕاسیی؟!

**دوو:** حوكمڕانیی ئیسلامیی ڕەسەن، كە لەسەر بناغەی ڕاوێژ (شوری) بنیات دەنرێ و سەرجەم بنەماكانی:

١- هەڵبژاردنەكان و،

٢- خەڵك سەرچاوەی دەستەڵات بوون و،

٣- دەستاو دەستكردنی دەستەڵات بە ئاشتییانە و،

٤- لە یەك جیاكردنەوەی دەستەڵاتەكان و،

٥- سەروەریی یاساو،

٦- دابینكردنی ماف و ئازادییەكان بۆ هەموو لایەك بێ جیاوازیی و

٧- چەسپاندنی دادگەریی، تێدا بەرجەستە دەبن، وە ئەو شێوە حوكمڕانییە لە

ڕۆژگاری پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و چوار خەلیفەكانی: (أبو بكر، عمر، عثمان، علي)دا (خوا لێیان ڕازی بێ)، زۆر باش جێبەجێ بوو، بەڵگەیەكی پتەوو نكوولیی لێ نەكراوە، لەسەر ئەوە كە دەگونجێ سەرجەم میكانیزم و بنەمایەكانی دیموكراسیی، لە سایەی حوكمڕانییەكی ئیسلامییدا بچەسپن، جگە لە مەسەلەی حەرام و حەلاڵ دانە دەست خەڵك، كە لە ڕاستییدا ئەوەش نەخۆشیی و خاڵی بێهێز (نقطة الضعف)ی دیموكراسییەو، وەك پێشتریش باسمان كرد: لە سایەی پابەندیی بە شەریعەتەوە "شەریعەتی ئیسلام" ئەو نەخۆشیی و خاڵە بێهێزەش چارەسەر دەكرێ، چونكە شەریعەت دەبێتە شوورەو پەرژینێك و، دیموكراسیی لە لادان (إنحراف) دەپارێزێ!

**٣- دیموكراسیش كێشەی هەن: ئابووریی، كۆمەڵایەتیی، ئەخلاقیی.. هتد.**

**وەڵام:**

منیش پشتگیریی قسەكەی ڤیڤیۆركا دەكەم، كە بێگومان هیچ ئەزموونێكی بەشەر لە هەر بوارێكدا، لە كەم و كوڕیی و هەڵەو پەڵە خاڵی نابێ، ئنجا هەر لێرەشەوە دەڵێم:

یەكێك لە سیفەتە باشەكانی ڕۆژئاواییەكان بە گشتی، ئەوەیە كە بە ڕەهایی تەسلیمی هیچ بیرۆكەو ئەزموونێك نابن و، هەمیشە بە ڕووحی ڕەخنە لێگرتن و عەیب و هەڵە تێدا دیتنەوەی، مامەڵەی لەگەڵدا دەكەن.

ئنجا ئەو هەڵوێستەی ڤیڤۆركا لە كوێ و، هەڵوێستی كاك مەلا بەختیارو هاوەڵە سیكۆلارەكانی لە كوێ، كە پێهەڵاگوتن و ستایشی ڕەهای دیموكراسیی و سیكۆلاریزم، ویردی سەر زمانیانەو، هەرگیز مافی ئەوە بە خۆیان نادەن، كە كەم و كوڕیی و هەڵەو پەڵەیەكیان تێدا بەدی بكەن!!

**٤- منیش پشتگیریی ئەو قسەیەی تۆ دەکەم کە دەڵێی دیموکڕاسیی پێش یۆنانییەکانیش "وەك نێوەڕۆکەکەی" هەر هەبووە.**

**وەڵام:**

خەسڵەتێکی دیکەی پەسندی زۆرێك لە ڕۆژئاواییەکان بە گشتی، ئەوەیە کە کاتێك هەقیان دەکەوێتە بەر چاو، لەلایەن بەرانبەرەکەیانەوە، دانی پێدادێنن و لێیان دەسەلمێنن.

کە بێگومان ئەوەش سیفەتێکی بەرزو جوانە، لە هەر کەسێکەوەبێ، هەروەك پێچەوانەکەیشی: نەسەلماندنی هەق و دان پێدانەهێنانی، لە هەر کەسێکەوە بێ، سیفەتێکی پەست و خراپە.

هەڵبەتە ئیسلامیش لەگەڵ هەموو خێرو چاکەو پەسندییەك دایە، لە هەر لایەکەوەبێ و، دژی هەر خراپەو ناپەسندییەکیشە، لە هەر کەسێکەوەبێ، هەر بۆیەش زانایان وەك بنچینەیەك گوتوویانە: (أُنظُرْ إِلى مَا قِيْل، وَلاَ تَنْظُرُ إِلى مَنْ قَال)، واتە: تەماشا بکەو سەرنج بدە چی گوتراوە، تەماشا مەکە کێ گوتوویەتی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ ، أَشْهَدُ أَنَّ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ ، أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

٢٤/ شَعْبَان/ ١٤٣٧ ك

٣١/ مایسی/ ٢٠١٦ ز

هەولێر

## بەرهەمەکانی دانەر

**تێبینی: بەپێی ڕیزبەندیی کاتی چاپکرانیان، ڕیزکراون.**

١- پوختەیەك دەربارەی ئیسلام. چاپی١/١٩٨٤، چاپی٢/ ٢٠٠٦.

٢- دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان. چاپی١/١٩٨٥، چاپی٣/ ٢٠٠٦.

٣- یادی خوا، گرنگی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤ دا. چاپی ١ /١٩٨٧

٤- کۆمەڵی خوا. چاپی ١ / ١٩٨٨

٥- پێشمەرگەی ئیسلام، یان مسوڵمانی موجاهید کێیەوچۆنە؟ چاپی١/١٩٨٨، چاپی٣ /٢٠٠١.

٦- دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسلامیی. چاپی ١ /١٩٨٩

٧- ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون. چاپی١/١٩٩٠، چاپی ٥ /٢٠١٢.
تێبینی: وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبیء فارسییش.

٨- کوردستان بۆ وێران بووء چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟!. چاپی ١ / ١٩٨٩

٩- حوکمی گەڕانەوە ژێر نیری گاغووت. چاپی١/ ١٩٩٠، چاپی ٢ /٢٠٠٥

١٠- سۆزی نەتەوایەتی و بیری ناسیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسلامدا. چاپی١/١٩٩٠، چاپی ٣ /٢٠٠٥.

١١- چارەسەری کێشەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٢

١٢- بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەمان دا. چاپی ١ /١٩٩٣

١٣- بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئایندەیەکی گەش و ڕوون. چاپی ١ / ١٩٩٥

١٤- پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی. چاپی ١ / ١٩٩٦

١٥- چەند ڕێڕوونییەك بۆ ئیسلامییەکانی کوردستان. چاپی ١ /١٩٩٦

١٦- ئیسلام و کێشە هەنووکەییەکان. چاپی ١ /١٩٩٨

١٧- با وریا بین! داڕووخانی ڕەوشت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبات. چاپی ١/١٩٩٩، چاپی ٢ /٢٠٠٧.

١٨- مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی ١-٤. چاپی١/ ٢٠٠٠، چاپی ٢٠٠٩/٢.

١٩- گەڕانەوە بۆ لای خوا "عز وجل". چاپی ٢٠٠١/١، چاپی ٥ /٢٠١٠.

٢٠- زانایانی ئیسلام کێن و چۆنن ؟!. چاپی ٢٠٠٢/١، چاپی ٣ / ٢٠١١

تێبینی : بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢١- بنچینە گرنگەکانی هەڵس وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا. چاپی ١ / ١٩٩٩ .

تێبینی: بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە.

٢٢- مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێران کردن دا. چاپی ١ /٢٠٠٠

٢٣- تاقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ چاپی ٢٠٠١/١، چاپی ٢ /٢٠١٢.

٢٤- بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی. چاپی١ /٢٠٠١، چاپی٣ /٢٠١٤

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش.

٢٥- کۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەکانی.، چاپی ١ /٢٠٠١.

٢٦- ئافرەتی مسوڵمانی کورد مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی. چاپی ١ /٢٠٠٣.

٢٧- مەوسووعەی: ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، بەرگی یەکەم چاپی ١/٢٠٠٢، بەرگی ١و٢ چاپی ٣/ ٢٠١٣

٢٨- چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم. چاپی ١/٢٠٠٢، چاپی ٦ / ٢٠١٦

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش.

٢٩- چەند ڕێڕوونییەك بۆ خوشك و برایانمان لە هەندەران. چاپی ١ /٢٠٠٢

٣٠- سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسین محمد عزیز). چاپی ١/ ٢٠٠١، چاپی ٢ / ٢٠٠٣

٣١- چۆن هەڵس وکەوت لەگەڵا خەڵکی دا بکەین؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی.

٣٢- شەهید کێیەو چ پلەوپایەیەکی هەیە ؟! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٣- جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك.چاپی ١/ ٢٠٠٢

٣٤- بۆئەوەی لەسەر جیهادکردنمان قەرزدار نەبینەوە! چاپی ١ / ٢٠٠٢

٣٥- جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەکرێ و چۆن دەکرێ؟ چاپی ١/ ٢٠٠٢.

٣٦- ئەشکەنجەو زیندان (چاوپێکەوتنی هاوژین عومەر). چاپی ١/٢٠٠٥، چاپی ٣/ ٢٠٠٩ .

تێبینی: وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسیشی کراوەو چاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆ زمانی ئینگلیزیش وەرگێڕراوەو چاوەڕێی چاپە.

٣٧- کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) چاپی ١/ ٢٠٠٥، چاپی ٢ / ٢٠٠٦.

٣٨- ئیسلام و مسوڵمانەتیی و کاری ئیسلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا. چاپی ١ / ٢٠٠٦ .

٣٩- مەوسووعەی: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی ١-٦، چاپی ١/٢٠٠٦-٢٠٠٨، چاپی ٢/٢٠١٦.

٤٠- تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٣.

تێبینی: زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقــە لە هەفتەنامەی (هاووڵاتیی)و ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی (ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە.

٤١- گەنجەکانمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا، چاپی ١/ ٢٠٠٦.

تێبینی: بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە.

٤٢- بەدوورخستنەوەی ئافرەت لە ئیسلام چ زیانێك دەكەین؟، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٣- سیاسەتی ئیسلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٤- چۆنیەتی بوونە پێشەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٥- چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی، چاپی ٢٠٠٦/١.

تێبینی: بۆ فارسییش وەرگێڕراوە.

٤٦- قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنماییەك، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٧- خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٨- بانگەواز بۆ لای خوا، چاپی ٢٠٠٧/١.

٤٩- قوتابییان لەم هەل و مەرجەدا، پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!، چاپی ٢٠٠٨/١.

٥٠- خواناسیی، ئایین، ئیمان، چاپی ٢٠٠٢/١، چاپی ٢ / ٢٠٠٩.

٥١- واقیعی هەرێمی کوردستان، دیدێکی ئیسلامییانە، چاپی ١/ ٢٠٠٨.

٥٢- چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، چاپی ٢٠٠٨/١، چاپی ٢٠١٥/٢.

تێبینیی: بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە.

٥٣- با لەخزمەت قورئاندابین، {کۆی هەردووك كتێبی: (چۆن باشتر لەقورئان

بەهرەمەند دەبین؟) وە (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بەقورئان)ە}، چاپی ٢٠٠٨/١و ٢٠١١، چاپی ٢٠١٥/٢

٥٤- سروشت و پایەكانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عەقڵدا، چاپی ٢٠٠٩/١.

تێبینی: ئەم نامیلكەیە بە(١٤) ئاڵقە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بڵاوكراوەتەوە.

٥٥- پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، چاپی ٢٠٠٩/١، چاپی ٢٠١٣/٣.

٥٦- چەند بابەتێكی سیاسی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشنایی عەقڵ و وەحییدا، چاپی ٢٠١٠/١.

٥٧- وتاری كۆنگرەی دووەمی كۆمەڵی ئیسلامیی/٢٠١٠.

٥٨- گەنج لە پرسە هەنووكەییەكاندا (چاوپێكەوتنی ناجیح حەمە فەرەج). چاپی ١ ٢٠١٠.

٥٩- كاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦٠- حوكمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦١- چەند بنەمایەكی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا، چاپی ٢٠١٣/١.

٦٢- خاتوون مەلاژن: ئافرەتێكی هەڵكەوتوو و هاوسەرێكی ناوازە. چاپی ٢٠١٢/١.

٦٣- ڕەوەندی كورد لە هەندەران و ئەركی سەرشانی. چاپی ٢٠١٢/١.

٦٤- مەلای گەورە كۆیەو تەفسیرەكەی و چەند سەرنجێك، چاپی ٢٠١١/١.

٦٥- هەڵسەنگاندنێك لەبارەی: هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا، چاپی ٢٠١٢/١.

٦٦- یادو بۆنەو جەژنەكان و هەڵسەنگاندنێك، چاپی ٢٠١٢/١.

٦٧- ڕوونكردنەوەی بنەما شەرعییەكان و هێڵە گشتییەكانی كۆمەڵی ئیسلامیی، چاپی ٢٠١٢/١، چاپی ٢٠١٤/٣.

٦٨- مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی: ١-٤، چاپی ٢٠١٤/١-٢٠١٦.

٦٩- تەرجەمەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٠- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەكەم: سوورەتەكانی: (الفاتحة) و (البقرة)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧١- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم، سوورەتی: (آل عمران)، چاپی ٢٠١٢/١.

٧٢- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سوورەتی: (النساء)، چاپی ٢٠١٣/١.

٧٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سوورەتی: (المائدە)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٤- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سوورەتی: (الأنعام)، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٥- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شەشەم: سوورەتی: (الأعراف)، چاپی ٢٠١٦/١.

٧٦- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال)، چاپی ٢٠١٦/١.

٧٧- هەڵوەشاندنەوەی بیروڕاو ڕەفتار و پەڕگیرانەكانی ڕێكخراوی (داعش)، چاپی ٢٠١٤/١.

٧٨- با هەڵەو لادانی پەڕگیران، بەرانبەر بەئیسلام نەمانخاتە دوودڵیی و گومان، چاپی ٢٠١٥/١.

٧٩- پەڕگیریی: هۆكارەكانی، شوێنەوارەكانی، چارەسەری، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٠- ڕوونكردنەوەی عەقیدەی طەحاویی، چاپی یەكەم/٢٠١٥.

٨١- سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان تێپەڕاندن و بەزایەداندا، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٢- چەند مەلۆیەك لەخەرمانی تەمەنم، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٣- بینینی خوای بەرزو مەزن لەدنیاو دوارۆژدا، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٤- گیانی ژیان، چاپی ٢٠١٥/١.

٨٥- چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٢٠١٥/٥/٣٠.

٨٦- مەوسووعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا.

٨٧- دیبەیتی ساڵ: سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لەکوردستاندا، چاپی ٢٠١٦/١.

**کتێبە عەرەبییەکان:**

موسوعة: الإسلام كما يتجلى في كتاب الله.

کە لەچاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لەچاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە:

٨٨- الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق والخلق.

٨٩- الكتاب الثاني: تعريف الإيمان.

٩٠- الكتاب الثالث: الإيمان بالله تعالى: الخالق الرب المالك الإله...

٩١- الكتاب الرابع: الإيمان بالملائكة وبالجن.

٩٢- الكتاب الخامس: الإيمان بكتب الله الحكيم.

٩٣- الكتاب السادس: القرآن العظيم.

٩٤- الكتاب السابع: الإيمان برسل الله وأنبيائه الكرام.

٩٥- الكتاب الثامن: خاتم النبيين محمد (صلى الله عليه وسلم): موجز سيرته وبراهين نبوّته.

٩٦- الكتاب التاسع: إهتداء الإنسان بهدى الله، أو الإلتزام الفردي بشريعة الله.

٩٧- الكتاب العاشر: إلتزام المجتمع بشريعة الله تعالى.

٩٨- الكتاب الحادي عشر: تطبيق المجتمع للشريعة و معالم الدولة في الإسلام.

٩٩- الكتاب الثاني عشر: الإسلام نظرة سديدة تجاه الناس وتعامل صحيح معهم.

١٠٠- نقض فكرة التطرف. ط١/٢٠١٦.

١٠١- ضيف و قضية (مقابلة مع قناة العربية)، ط١/٢٠٠٦.

١٠٢- حوار خاص (مقابلة مع قناة العالم)، ط١/٢٠٠٦.

**ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن:**

١٠٣- تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبە).

١٠٤- ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی هەرێم، گرفت و چارەسەر.

١٠٥- قەیرانە نێوخۆیی و دەرەکییەکانی هەرێمی کوردستان (پانێڵی ئەنیستیۆتی ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست)، ٢٠١٤/١١/٦.

١٠٦- كلمتان موجزتان حول مايجري على الساحة العراقية، (٢٠١٤ و ٢٠١٥).

# پێڕستی وشەکان

## خ



## د



## س



## ع



## ک



## م

## نێـوەڕۆك